# جیهاد لە ڕێی خوادا

# و

## چەند سەرنج و ئاگادارییەك


ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net



عەلی باپیر



چاپی سێیەم

١٤٢٢ك ٢٠٠١ ز



www.alibapir.net

# جیهاد لەڕێی خوادا

# و

## چەند سەرنج و ئاگادارییەك

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

علی باپیر

چاپی دووەم

١٤١٩ك ١٩٩٨ز

www.alibapir.net

# پێشکەش بێ

بەو موجاهیدانەی کە گەورەو گچکەیان شەرع زانانەو واقیع بینانە جیهاد دەکەن و، زۆر باش دەزانن کەی و لەکوێ و چۆن و وبۆچی ئەو چەك و هێزەی پێیانە بەکار دێنن و، بەهەر هەنگاوو هەڵوێستێکیان چ لەحاڵەتی هەڵس وکەوت ورەفتاری نێو خەڵك و چ لەکاتی جەنگ و بەرەنگاریدا سەرومەرییەك بۆ ئیسلام و مسوڵمانان تۆمار دەکەن و، دینداریکی هێندە هۆشیارو پارێزکارو فیداکارو خۆشڕەفتارو پەسند ئاکارن نەلەحاڵەتی جەنگ و نەلەحاڵەتی ئاشتیدا تا تەرازوو بەلای خۆیان دا خوار ناکەن و، بار بەلای ئیسلام دا لارناکەن و، قسەی ناحەزانی خوا لەئاست ئایینەکەیدا سوار ناکەن.



www.alibapir.net

# ڕێ خۆشکردن

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکانم:

ئەم نامیلکەیەی لەبەردەستتان جگە لەپێشەکی چاپی دووەم کە ڕوونکردنەوەی دوو ڕاستی گرنگی لەمەڕ جیهادی ئیسلامی یەکانی کوردستان وەخۆ گرتوەو، پێشەکی چاپی یەکەم کەسەر گوزشتەی سەرهەڵدانی ئەسڵی ئەم نامیلکەیەی تێدا ڕوون کراوەتەوە، لە دووبەش و چوار خاڵان پێك هاتوە بەم جۆرە:

## بەشی یەکەم: دەقی وتارەکە

کەدەقی ئەو وتارەیە کە کراوەتە ئەسڵی ئەم نامیلکەیەو لەحەوت (٧) خاڵان دا باسی (جیهادی) ی کردوە کە ئەمانەن:

١- پێناسەی جیهاد.

٢- خۆ ئامادەکردن بۆ جیهادو زەمینە سازی بۆ کردنی.

٣- جۆرەکانی جیهاد.

٤- قۆناغەکانی جیهاد

٥- پێداویستییەکانی جیهاد.

٦- ئامانجەکانی جیهاد

٧- جیهاد لەواقیعی ئەمڕۆمان دا.



www.alibapir.net

## بەشی دووەم: چەند ئاگاداری یەك دەربارەی جەنگ وجیهاد

ئەمیش لەم حەوت خاڵانە پێك هاتووە:

١- جەنگ وجیهاد ئەركێك نیە بەهەموو كەس ئەنجام بدرێ.

٢- جیهاد عیبادەتێكە بۆ خوا دەكرێ ونابێ منەت لەسەر خەڵك بكرێ،

٣- جیهاد بەبێ خۆڕاگری لەبەردەم هەژاری داو چێژتنی تاڵاوی نەداری ناكرێ.

٤- دەستووری هەڵس و كەوت لەحاڵەتی جەنگ و غەیری حاڵەتی جەنگ دا جیاوازە.

٥- بابەهەڵە لەپرستەی﴿ولا يخافون لومة لائم﴾ (لەلۆمەی لۆمەكەران ناترسن)حاڵی نەبین.

٦- جەنگ وجیهاد بەدیلی بانگەواز نیەو بەپێچەوانەشەوە بەڵكو تەواوكەری یەكترن.

٧- باڵە پێشاندان و پاراستنی عیزەت و هەیبەت دا بەهەڵە نەچین!

ڕەنگە هەندێك كەسیش تێبینی یان هەبێ لەسەر هەندێك لە ئاگاداری یەكان كەباسی شتی نێو خۆی ئیسلامی یەكان دەكەن. بەڵام ئەو جۆرە بیركردنەوەیەم پێ ڕاست نیە، چونكە ئەو جۆرە عەیب و كەم كووڕی یانە -لەگەڵ پروپاگەندەی ناحەزانەدا- پەنهان وشاراوەنین و بوونە بنێشتە خۆشەی سەر زاری دۆست و دوژمن و خۆ لێ بێ دەنگ كردنیان



www.alibapir.net

هیچ لەوەرزەکە ناگۆڕێ وبگرە زەرەری زۆریشی هەیە، ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە من هەر بەجیددی بەپێویستی دەزانم دۆست ودوژمن ئاگاداربنەوەو بزانن کەئیسلام لەهەر هەڵەو پەڵەیەك بەرییەو، با بەناهەق ئیسلامی پاك وبەرز بەهۆی هەڵەوە کەمو کوورییەکانی هەندێك لەمسوڵمانانی کرچ وکاڵەوە ناشیرین و تۆمەتبار نەکرێ وبوختانی پی نەکرێ!.

هیوا داریشم هەم حەوت کورتە باسی نێو وتارەکە لەبەشی یەکەم داو هەم حەوت ئاگادارییە گرنگەکانی بەشی دووەم، بۆ دۆست ودوژمن بەرچاو ڕۆشن کەرەوەو گرێ کوێرەی دڵ کەرەوە بن و، بۆ ئەوانەش کە لەگۆڕەپانی ئیسلام دا کاردەکەن و لەژێر بەیداخی جیهاد دان وخۆیان یان دەورو بەریان گیرۆدەی هەڵەوپەڵەو ڕەفتاری خوارو خێچ بوون ، نقورچکی بێدار کەرەوە بن، بەشکم خوا بکات لەبەرەکەتی ئیخلاص و پابەندیمان بەشەرعەوە ببینە مایەی سەربەرزی ئیسلام ومسوڵمانان و ، بەڵگەی ئایینی خوا بین بەسەر خەڵکەوە نەك خوا نەکردە بەڵگەو بیانووی دەستی خەڵکی بین بەسەر ئایین و بەرنامەی خواوە، خوای دادگەرو میهرەبانیش فەرموویەتی:

﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ..﴾ (البقرة: ١٤٣)

١٤١٩/٥/٣ کۆچی
١٩٩٨/٨/٢٥ زایینی
هەڵەبجە

ameer.maktab@yahoo.com

/AliBapir

/AliBapir

/MediaAmeerOffice
www.alibapir.net



www.alibapir.net

# پێشەکی چاپی دووەم
# دوو ڕاستی گرنگ

اَلْحَمْدُللهِ وَحْدَهُ والصَّلاة والسَّلام عَلىٰ مَنْ لانَبيَّ بَعْدَه مُحمد المبعوثِ رَحْمَةً لِلْعالمينْ إمامِ المتقينَ وَقائِدِ المجاهدين وآلِهِ أجْمَعين مِنَ القَرابةِ والصَّحابَةِ والتابعين لَهُمْ بأحسانٍ إلىٰ يَوْمِ الدِّين.

**خوێنەری بەڕێز:**

لەم پێشەکی‌یەدا کە بۆ چاپی دووەمی نامیلکەی ( چۆن لە جیهاد بگەین؟! ) دەینووسم بەپێویستی دەزانم ئاماژە بۆ دوو ڕاستی گرنگ بکەم کە لەڕاستی‌دا یەکەمیان ئاگاداری‌یەکە بۆ ئیسلامی‌یە موجاهیدەکان و، دووەمیشیان بۆ غەیری ئەوانە کە بەهەڵە لە جیهادەکەیان حاڵی نەبن و بەناهەق تۆمەتی بەدیان بۆ هەڵنەبەستن:

**یەکەم:** بێگومان ئامانجی هەرەبەرزی جەنگ و جیهاد لەپێناوی خوادا (تبارك وتعالى) ئەوەیە کەلەسایەی چەسپاندنی حوکمی خواو بەرپاکردنی بەرنامەکەی‌دا لەژیان و گوزەرانی تاکی‌و کۆمەڵی ومەعنەوی‌و سیاسی خەڵك وکۆمەڵگادا دادگەری هەمەلایەنە بێتەدی‌و ستەم و بێ دادی بەهەموو جۆرو شێوەکانی‌یەوە لابچێ‌و نەمێنی، تاکو هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا -بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە- لەکۆیلایەتی‌و ژێردەستەیی ڕزگارولە چەوسێنرانەوەو ماف پێ شێل کران قورتار بن و. ئەم ژیانە کورتە پێنج و دووڕۆژەیی یەی دونیا ئازادانەو سەربەزانە وەك ئینسانێکی خاوەن کەرامەت‌و ڕێز لێ گیراو لەلایەن خواوە بەرێ بکەن



www.alibapir.net

وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴾ (الحديد:٢٥)

واتە: بێگومان ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان بەبەڵگە ڕوونەکانەوە ڕەوانە کردوەو کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوو نەخوار، تاکو خەڵك دادگەرانە بەڕێوە بچن، وە ئاسنیشمان ناردۆتە خوار هێزێکی توندی تێدایە وێڕای بەرژەوەندی گەلێك بۆ خەڵکی، بۆ ئەوەی خوا -لەمەیدانی واقیع دا- بزانێ کێ خۆی وپێغەمبەرەکانی بەپەنهانی -واتە لەحاڵێك دا کەپەنهانن لێی- سەردەخات! بێگومان خواش بەهێزی زاڵە.

کەواتە: خەبات وجیهادو فیداکاری مسوڵمانان کەمایەی ڕەزامەندی خواو گەیشتن بە بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەیە لەدواڕۆژدا، لەدنیاش دا سوودو بەرهەمەکەی تەنیا لەسەر مسوڵمانان تاپۆ نەکراوە بەڵکو لەخزمەت هەموو تاکەکانی کۆمەڵگادایە بەگشتی و هەموویان -بەمسوڵمان و نامسوڵمانەوە- لەبەر سێبەری دا دەحەسێنەوەو لێی بەهرەمەندو پێی سەربڵند وبەختەوەر دەبن و، ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر زەوی تەنها لەسایەی جیهاد دا لەگەندەڵی و پۆخڵی پارێزراوو سەلامەت دەبێ. وەك خوای میهرەبان فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْلَا دَفْعُ اللهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَفَسَدَتِ الْأَرْضُ وَلَكِنَّ اللهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ ﴾ (البقرة:٢٥١) جا مادام ئەو ئەرکە گرنگ و بەرزو مەزنەی ئێمەی موجاهید لەژیانی دنیامان دا پێی هەڵدەستین -کەجیهادو خۆبەخت کردنە لەڕێی خوادا بۆ بەرپاکردنی ئایین و بەرنامەکەی- خزمەتێك بێ ڕێکپرایی چین وتوێژەکانی کۆمەڵگای تایبەتی خۆمان وکۆمەڵگای گشتی و فراوانی مرۆڤایەتیش بکرێ، پێویستە زۆر هۆشیارو بێدار بین و بەهیچ جۆرێك و بەهیچ پاساو (مبرر) و بیانوویەکەوە قسەو ڕەفتارو هەڵس و کەوتو


www.alibapir.net

مومارەسەی هەڵەو ناشەرعیمان لێ نە پشکوێتەوە کە خوانەکردە بۆ ئەوەی هەست بکەین یان بمانەوێ ببینە مایەی دڵساردی و ڕەنجاندن و سڵەماندنەوەی خەڵکی لە ئایین وبەرنامەی خواو، لەجیاتی ئەوەی بەڵگەی ئیسلام بین بەسەر خەڵکەوە ببینە بەڵگەی خەڵك بەسەر ئیسلامەوەو، لەباتی ئەوەی خەڵك بەهۆی ئێمەوە بەرەو ئیسلام بگەڕێتەوە و لەخوا نزیك بێتەوە، لەئیسلامێك کە ئێمە بەهۆی هەڵەو پەڵەو کرچ و کاڵی خۆمان شێواندوومانەوبێزاندوومانە ڕابکەن و نەزانانە لەخوا دووربکەنەوە! کەبێگومان ئەو کاتە بمانەوێ ونەمانەوێ وپێمان خۆش بێ یان پێمان ناخۆش، ئیسلامی بێ هەڵەو پەڵەو بەرزوپاك لەسەر بوونی ئێمەو بەناو جیهادەکەشمان قەرزدار دەبێتەوە!

دیارە من لێرەدا مەبەستم ئەوەنیە کە خەڵك وجەماوەری خۆمان لەسەر حیسابی ئیسلام وشاردنەوەی ڕاستییەکانی لەخۆمان ڕازی بکەین، یاخود خەڵکی نامسوڵمان و ناحەزو نەیار بەئیسلام وجیهاد، ڕازی بکەین، چونکە ئەوە ڕەنج بەخەساری وشەرمەزاری دنیاو قیامەتی تێدایەو، دوژمن و ناحەزانیشمان بەهیچ لێمان ڕازی نابن و دەست بەرداری دوژمنکاریو خراپە کارییان نابن هەتا دوایین قۆناغ و هەنگاوی ئەو دوژمنایەتییە کە بریتییە لەلادان و هەڵگێڕانەوەمان لە ئایینی خوا. وەك خوای پەنهان بین فەرمویەتی: ﴿وَلَن تَرضَىٰ عَنكَ اليَهُودُ وَلا النَّصارىٰ حَتّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ..﴾ (البقرة:١٢٠) . هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلا يَزالُونَ يُقاتِلُونَكُمْ حَتّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطاعُوا.﴾ (البقرة: ٢١٧).

بەڵام ئەوەی کەمن مەبەستمەو داکۆکی لەسەر دەکەم ئەوەیە کە ئێمەی ئیسلامی کارێك نەکەین کە دژو پێچەوانەی ئەوئیسلامە بێ کەبە حیساب لەپێناویدا تێ دەکۆشین، وە بەشێوەیەك هەڵس وکەوت نەکەین کە خەڵك بەڵگەی شەرعی لەسەرمان هەبێت، کە بەداخەوە لەم



www.alibapir.net

ڕۆژگارەدا لەسەر ئاستی کوردستان‌و غەیری کوردستانیش ئەو جۆرە ڕەفتارو مومارەسە هەڵەو کرچ وکاڵە ناشەرعیانە هەن ودەکرێن و، بوونە مایەی دڵتەنگی و ڕەنجانی خەڵکی مسوڵمان‌و دۆست و، بیانوو کەوتنە دەست و دەم کرانەوەی نەیارانمان...

جا بەهیوای ئەوەی کە هەموولایەکمان جەربێنە هەوڵ وهیمەتمان بخەینەکار بۆ نەهێشتن و بن بڕ کردنی ئەو جۆرە هەڵس و کەوت و مومارەسە ناشەرعی‌یانە و بژار کردن وپاککردنەوەی کارو چالاکی و جیهادەکەمان لەو گژوگیاو گیاکەڵە پیس و زیان بەخشانە.

**دووەم:** بەداخەوە گەلێك کەس کە بەحەقیقەتی ئیسلام ئاشنا نین و بەقیاس لەسەر قسەو وتارو کردەوەو ڕەفتاری ناشەرعی‌یانەو سەرکێڵانەی هەندێك لەو مسوڵمانانەی کە بەخەیاڵی خۆیان جیهاد دەکەن بۆ بووژاندنەوەی ئیسلام و هێنانەوەکایەی حوکمی خوا، کۆمەڵێك بیرو بۆ چوون و قەناعەتی هەڵەو ناتەواویان سە بارەت بە جیهادو خەباتی چەکداری لەئیسلام دا بۆدروست بوە، بۆ وێنە پێیان وایە کە بزووتنەوەو کۆمەڵە ئیسلامی‌یەکان لە هەرشوێنێکی دنیا دەستیان دایە چەك وهێز ئەوە بۆ قەڵاچۆکردن و بن بڕکردنی هەموو ئەوانەیە کەمسوڵمان نین بەهەموو جۆرو شێوەکانیانەوە! کەبێگومان ئەمە لە ڕاستی‌یەوە دوورە، چونکە جارێ لەهیچ شوێنێکی جیهانی ئیسلامی‌دا نیە کەموسڵمانان پەنایان بۆ چەك بردبێ مەگەر بەناچاری‌و لەژێر فشاری زوڵم وستەم و چەوساندنەوەی دوژمن‌و ناحەزانیان دا، ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەشەوە مسوڵمانان لەحاڵەتی جەنگ وجیهاد دابن یان حاڵەتی ئاشتی وئاسایی لەسەریان فەرزە کە پابەندو مل کەچی شەرعی خوا بن و، بۆیان نیە بەکەیف و ئیشتیای خۆیان دینداری بکەن، بەڵکو دەبێ موو بەموو بەگوێرەی بەرنامەی خوا بەڕێوە



www.alibapir.net

بچن ولێی لانەدەن، وەك خوای کاربەجێ بەپێغەمبەری خۆی (محمد ﷺ) دەفەرمووێ: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِنَ الأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ.. ﴾ (الجاثية: ١٨).

ئینجا وەك پێشتریش ئاماژەمان پێ کرد ئەو کیان و قەوارە سیاسی‌یەی کە لەسەر بناغەی ئیمان بنیات دەنرێ‌و، بۆ بەڕێوەبردنی حوکم و بەرنامەی خوا دادەمەزرێ، بۆ هەموو تاکەکانی کۆمەڵگایە بەکافرو مسوڵمانەوەو تایبەت نیە بە ئەهلی ئیمانەوە، وەك لەسیرەو ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)و چوار جێ نیشینە سەر ڕاستەکانی‌دا خوا لێیان ڕازی بێت بەتایبەت دەردەکەوێ‌و، لەدرێژەی مێژووی سێزدەسەدەیی حوکم‌و دەستەڵاتی ئیسلامی‌دا لەچاخی ئەمەوی‌و عەبباسی‌و عوسمانیەکاندا بەگشتی دەبینرێ، کە هەموو خاوەن ئاین و ڕێچکەو فیکرەکان شان بەشانی مسوڵمانان لەکۆمەڵگای فراوانی ئیسلامی‌دا ژیاون و هەموو مافێکیشیان بۆ داین کراوەو پارێزراوەو، مێژوو نووسەبیانی‌و نامسوڵمانە ڕۆژهەڵاتی‌و ڕۆژئاوایی‌یەکانیش پێش مسوڵمانەکان دانیان بەم ڕاستی‌یەدا هێناوەو نەیانتوانیوە لام‌وجیمی تێدابکەن.

**کەواتە:** با بەناهەق تۆمەتی ناڕەوا بۆ ئیسلام هەڵنەبەسترێ‌و، لەپشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای نەکرێ‌و، لەسۆنگەی قسەو ڕەفتارو هەڵس‌و کەوتی ناشەرعی‌یانەو نالەباری هەندێك لەوانەی لە مەیدانی کاروچالاکی‌و جموجوڵی ئیسلامی‌دا بەهۆی چاك تێ‌نەگەیشتن‌و باش پێ‌نەگەیشتنەوە گیرۆدەو دووچاری هەڵەو پەڵە دەبن، وەك ملۆزمی کۆمەڵگاو شتێکی خەتەرو مەترسی‌دار تەماشای جیهادو موجاهیدان نەکەین و قیاسی کەشکێ لەمەشکێ نەکەین!



www.alibapir.net

وەلە کۆتایی ئەم پێشەکی‌یەدا دەڵێم:

با هیچ کەسیش وانەزانێ کە جیهادو چەك هەڵگرتنی بزووتنەوەی ئیسلامی لەم قۆناغەدا لەکوردستان دا بەمەبەستی (فتوحات) کردن و ئەم گوند ئەو شار گرتنە ! بەڵکو لەم قۆناغەدا بۆ بەرگری کردن لەخەڵکی مسوڵمانی کوردستان لەلایەك و لەلایەکی دیکەشەوە، بۆ ئەوەیە کە هیچ کەس نەتوانێ ڕێگای بانگەوازو ڕاگەیاندنی پەیامی خوامان لێ بگرێو، لەبەر بێ دەسەڵاتی‌و بێ درکی‌و بێ ئازاری بەناهەق شەرمان پێ بفرۆشێو یەخەمان پێ بگرێ. وەلە ڕاستی‌دا لەکورستان‌و غەیری کوردستانیش دا مسوڵمانان هەتا کیان وقەوارەیەکی سیاسی‌و دەستەڵاتێکی شەرعی (سلطة شرعية) یان بۆ نەڕەخسێ، پێویستە جیهادەکەیان هەر لەحاڵەتی جیهادی بەرگری لە خۆکردن و خۆپاراستن دابێ، ئاشکرایە کە کیان‌و قەوارەی سیاسی‌و دەستەڵاتی شەرعیش لەئیسلام دا بەتەنها بەوەندە پێك نایەت کە هێزی چەکدارت زۆر بێ لەناو چەیەك دا وکەڵەکەت کردبێ.

چونکە حوکم وکیانی ئیسلامی بەرلەوەی هێزێکی ترسێنەر بێت، پەناو سێبەرەو، بەر لەوەی پێویستی‌یەکان (الواجبات) لەسەر خەڵك فەرز بکات پێداویستی‌یەکانیان دابین دەکات و، لەپێش ئەوەدا کە موحاسەبەیان بکات و سزایان بدات، هەق و مافەکانیان پێ دەدات، تاکو لەناچاری‌و تێگیراوی لادان‌و خراپەکاری ڕزگاریان بکات و، وایان لێ بکات کە بەڵگە-یان بیانووی –سەرپێچی‌و سەرەڕۆیییان بەدەستەوە نەمێنێ، بەهیوای ئەوەی کە هەموومان بە مسوڵمان ونامسوڵمانەوە چاکترو زیاتر لەڕووی قورئان و سوننەتەوە لەئیسلام حاڵی ببین و لەچەمکی جیهاد بگەین. نەك خوانەکردە بێ ئاگایانە یان لەکاردانەوەی وتارو ڕەفتاری هەڵەو پەڵەدا هەقو ناهەقمان لێ تێکەڵ بێو دووچاری بۆ چوون وهەڵوێستی هەڵە ببین.

ئینجا من ئەم چەند دووعایە دەکەم وئێوەش بڵێن ئامین ......



www.alibapir.net

خوایە ئێمـەی ئیسـلامی لەکوردسـتان و غـەیر کوردسـتانیش دا سەرکەتوو بکەی کە وەك پێویسـت لـە ئایین و بەرنامەکەت حـاڵی بین، ئەوەك -خوانەکردە- چالاکیو جم وجۆڵمان بەجۆرێك بێ تۆ پـێی ڕازی نەبی و سەرەنجام لـەدنیادا ڕووزەردی لای خـەڵك و لەقیامـەتیش ڕەنج بەخەساری بەردەرگای تۆ بین! وە خوایە تەوفیقمان بدەی کە لەناسینی خۆمان و بەرانبەرەکەمان دا لـەڕووی هێزو توانـاوە بەهەڵـەدا نـەچین و، بەبیانووی پشت بەخوا بەستن (توکل)ەوەبەمەرەدی ئەوفەقیرحاڵـە نەچین کەبێ ئەوەی مەلە بزانێ لەگـەڵ کـافرێکی مەلـەوان دا لـەدەریادا پێش برکەی مەلەوانی دەکات وپێی وایە هەر لەبەر ئەوەی خۆی مسوڵمانەو ئەو کافرە، بەبێ مەلەزانینیش بۆری دەدات !

وەخوای پەروەدگار هیدایـەتمان بـدە کـە دەرك وناسـینێکی واقیـع بینانـەمان دەربـارەی ئـەم قۆناغـەمان هـەبێ کـەپێیدا تـێ دەپـەڕین، کەقۆناغی چەوسێنرانەوە (إستضعاف)و بێ حوکمییەو، لەگـەڵ قۆنـاغی دەسـت ڕۆیشـتوویی (تمکـین) دا تێکـەڵی نەکـەین و ئـەوەی کـەدەبێ لەوەرزی بەهاردا بکرێ، لە پاییزدا دەستی پێ نەکەین!

وە ئەی خوای خاوەن لوتف و کەرەم بمانپارێزی و چەپاڵـەمان بدەی کە دووچاری دەردی گۆشـەگیریو لەکۆمـەڵ دابـڕان بـین و، لەئـەنجامی ئـەوەش دا ببینـە کەسـانێکی ئایدیـالی و مثـالی، و نـاواقیعی وشـتیوا بەناوی ئسیلامەوە بڵێین کە وێڕای ناشەرعی بوونی ببینە مایەی گاڵتـەو پێکەنینی خەڵکیش !

وە خوایە لـەکاتی بانگـەوازدا حیکمـەت و لەحاڵـەتی هـەڵس وکـەوت وتعـامل دا دادگـەری وچاکەکـاریو، لەگـەرمەیبـەرەنگاریدا غـیرەت و فیداکاریمـان پـێ ببەخشـیو، لـەدەمی سـەرکەوتن و زاڵبوونمـان دا لـە لەخۆبایی بوون (غرور)و. لەوەختی تێشکانیش دا لە نائومێدی (یاس) بمانپارێزی ئامیـــــن...



www.alibapir.net

# پێشەکی چاپی یەکەم

خوێنەرانی بەڕێزو خوشەویستم.
سەلام ورەحمەت وبەرەکەتی خواتان بڕژێتە سەر..
ئەم نامیلکەیەی بەردەستتان دەقی وتارێکە کە لەڕۆژی جومعەی (١٩٩٨/٥/٢٢) لە مزگەوتی (جیهاد) دا لەشاری سلێمانی لەلایەن بەندەوە خوێندراوەتەوەو، برایەکی خۆشەویستی مەڵبەندی سلێمانی لەسەر کاسێتەوە هێناویەتە سەر کاغەزو، دواتر برای بەڕێزو دڵسۆزم مامۆستا حسن بابکر نووسیویەتەوەو پێیدا چۆتەوەو ئامادەی کردوە بۆ چاپ. دیارە جگە لەچەند وردە دەستکاری‌یەك لە چەند ووشەو تەعبیرو ریزبەندی مەسەلەکانی‌داو زیاد کردنی چەند پەراوێزێك،وتارەکە وەك خۆی هێڵراوەتەوەو دەستکاری جەوهەرو نێوەڕۆکەکەی نەکراوە، وەلە ڕاستی‌دا ئەگەر داواکاری‌و سوور بوونی هەندێك لە برایانی دڵسۆز نەبوایە حەزم نەدەکرد ئەو ووتارە بکرێتە نامیلکەو چاپ بکرێ، چونکە مەسەلەی جیهاد ناکری لە دووتوێی وتارێك و دوواندا بخرێتە ڕوو. خوای میهرەبانیش پشتیوان بێ بەتەمام لە داهاتوودا لە کتێبێکی سەربەخۆدا مەسەلەی جیهاد بتوێژمەوەو بەخەست و خۆڵی باسی بکەم هیوادارم ئەم نامیلکەیەش کەلێنێك پڕ بکاتەوە هەتا ئەو هەل و دەرفەتەمان بۆ دەرەخسێ.
لەپێشەوەش لە خوای پەروەدگارو بەبەزەیی داوای لێبوردن دەکەم لەهەر هەڵەو کەم کورتی‌یەك، پاشانیش داوا لەبراو خوشکانی ئیسلامیم دەکەم، کە سەبارەت بە مەسەلەی جیهاد و جەنگ لەڕێی خوادا هەر تێ‌بینی‌و پێشنیارێکیان هەبوو بۆم بنێرن بەشکم لە نووسینی ئەو بابەتەدا کە نیازی نووسینیم هەیە لێیان بەهرەمەند بم.
وە (سبحانك اللهم وبحمدك اشهد أن لا إله إلا أنت استغفرك واتوب إليك)
٥/صفر ١٤١٩کۆچی ١٩٩٨/٥/٣٠ زایینی
شارەزوور: ئەحمەد ئاوا
عەلی باپیر

www.alibapir.net

بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحَمْدَ لِلّهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعينُهُ ونَسْتَغفِرُهُ ونَعوذُ بالله مِنْ شُـرورِ أَنْفُسنا ومِنْ سَيِّئاتِ أَعْمالِنا مَنْ يَهْدِهِ الله فلا مُضِلَّ لَهُ ومَنْ يُضْلِلْ فَلا هاديَ لَهُ وأَشْهَدُ أَنْ لاّ إِلَهَ إلا الله وَحدَهُ لا شَرِيْكَ لَـهُ وأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ صَلَواتُ الله وسلامُهُ عَلَيْهِ وعلى آلِهِ وصَحْبِهِ وَمَنْ آهتَدى بِهَدْيِه..

﴿ يا أَيها الَّذين آمنوا إتقوا الله حَقَّ تقاتِهِ ولا تموتُنَّ إلا وأَنْتُم مسلمون ﴾

﴿ يا أيها الناس إتَّقوا ربَّكم الَّذي خلقكم من نَفْسٍ واحِدَةٍ وخَلَقَ منها زَوْجَها وَبثَّ مِنْهُما رجالًا كثيراً ونساءا واتقوا الله الذي تسائلون به و الأَرْحامَ إن الله كان عَليكم رقيباً ﴾

﴿ يا أيها الذين آمنوا إتَّقوا الله وقولوا قولاً سديداً يُصْلِحْ لكم أَعْمالَكُمْ وَيَغفِرْ لَكُمْ ذنُوبكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورَسولهُ فَقَدْ فازَ فوزاً عَظيْماً ﴾.

أَما بَعدُ:

فإنَّ أَصْدَقَ الحديثِ كِتابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ رسولِ اللهِ (ﷺ) وَشَرَّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها وَكُلَّ مُحْدثةٍ بدعةٌ وَكلَّ بِدْعةٍ ضَلالةٌ وكُلَّ ضَلالةٍ في النّارِ..

www.alibapir.net

# دەقی ووتارەکە

مسوڵمانانی بەڕێزو خۆشەویست وتاری ئەمڕۆمان لەمزگەوتی جیهاددا بریتیە لە باسی جیهاد، چونکە مەسەلەی جیهادو جەنگ کردن -واتە قِتالْ- لە پێناوی خوادا هەم لەلایەن ئەوانەی کە بەڕێی غەیری ئیسلامدا دەڕۆن، وەهەم بەنیسبەت هەندێك لەوانەش کەلە دائیرەو بازنەی ئیسلامیشدان جۆرێك لە نامۆیی‌و تەمومژکرانە سەری بۆ هاتۆتە پێش، دیارە مەسەلەی جیهاد لەڕێی خوادا مەسەلەیەك نیە ئێمە بتوانین لە ووتارێکدا هەموو باس و بابەتەکانی ڕوون بکەینەوەو پێناسەی بکەین و وەکو پێویست لێیەوە بدوێین، بەڵام هەوڵ دەدەین لەحەوت خاڵدا بەکورتی باسی بکەین، بەم شێوەیە:

١- پێناسەی جیهاد لەزمانی عەرەبی‌دا ولە زاراوەی شەرع و لەقورئان‌و سوننەتدا.

٢- خۆ ئامادەکردن (إِعْدادُ العُدَّة) بۆ جیهادو حوکم‌و چۆنیەتی یەکەی.

٣- جۆرەکانی جیهاد.

٤- قۆناغەکانی جیهاد.

٥- پێداویستیەکان -مستلزمات-ی جیهاد.

٦- ئامانجی جیهاد، یاخود ئەنجامێك کە لە جیهاد کردندا پەیدا دەبێت.

٧- جیهاد لەواقیعی ئەمڕۆماندا، کە بە مەفهومی فراوانی، عالەمی ئیسلامی‌وبەتایبەتی واقیعی کوردستانیش مەبەستە.

خوا پشتیوان بێ هەوڵ دەدەم لەمیانەی ئەم حەوت خاڵەدا ئەوەی پێویستە دەربارەی جیهاد بەکورتی ڕوونی بکەمەوەو بیڵێم.



www.alibapir.net

# یەکەم: پێناسەی جیهاد

ووشـــەی (جیـــهاد) ووشـــەیەکی عەرەبیـیـــە بـــۆ مەفـــهومو واتاکەشیپێوستە پێشەکی لە فەرهەنگ (قاموس)ی زمانی عەرەبیدا بگەڕێین، پاشان بزانین (فقهاء) زانایانی شەرع لەکتێبەکانیاندا چۆن باسیان کردووەو لەقورئانو سوننەتیشدا ووشەی جیهاد بۆچی بەکار هاتوە:

لەزمانی عەرەبیدا ئەسڵی ووشەی (جهاد) یەعنی: (بَذْلُ واَسْـــتِفْراغُ مافي الوُسْعِ والطَّاقَةِ مِنَ القَوْلِ والفِعْـــلِ). واتە: هەرچی لە تواندا هەیە بەکاری بێنی لەقسەو لەکردەوە، یـان هـەموو توانـای (نظـري وعملـي) خۆت بەکار بێنی.

زانایانی شەرعیش دەڵێن: جیهاد بریتییە لە: (بَـــذْلُ الجُـــهْدِ مِـــن المسلمین في قِتالِ الكُفّارِ والبُغاةِ والمُرتدّین ونَحْوِهِمْ). واتە: صەرف کردنو بەخشینی ئەو پەڕی توانا لەلایەن مسوڵمانانەوە بۆ جەنگ کردن وکوشتارکردن لە کافرانو یاخی بووانو هەڵگەڕاوان وئەوانەی وەکو ئەوانن.

ئینجا جیهاد لە ئەسڵدا بەپێی رای زانایان فەرزی کیفایەیە چونکە فەرز (واجب) دوو بەشە:

١- (فرض العین) ئەمەیە کەلەسەر هەر کەسێك واجب بێت، دەبێ خۆی ئەنجامی بدات، وەك: پێنج نوێژەکانو ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانو ئەوانی تر.

٢-(فرض الکفایـــة): ئەو فەرزەیە کە یەکێك لە مسوڵمانان یان کۆمەڵێکیان ئەو فەرزەیان ئەنجامدا ئەوا بەر ئەوانی تریش دەکەوێتو گوناهبار نابن ئەگەر نەیشیکەن.



www.alibapir.net

وەك باسمان كرد جیهاد لەسەر ڕەئی زۆربەی زانایان واجیبی كیفائییەو ئەگەر یەكێك یان كۆمەڵێك لە مسوڵمانان بایی ئەوە كە بتوانن ئەو ئەركە ئەنجام بدەن پێی هەڵسان، ئەوا لەسەر ئەوانی تر لادەچێت‌و گوناهبار نابن.

بەڵام جیهاد لەسێ كاتدا لەسەر تاك تاكی مسوڵمانانی ئەو شوێنە دەبێتە (فرض العین) ئەگەر هەر كامێكیان پێی هەڵنەستن مادام عوزرێكی شەرعی نەبێت گوناهبار دەبێت، كە ئەمانەن:

١) لەكاتێكدا مسوڵمان لەبەرەی جەنگدا بێت لەسەری واجب دەبێت جەنگ بكات‌و نابێ بێ هۆیەكی[1] شەرعی پاشەكشەو پشت لە دوژمن بكات.

٢) كاتێك دوژمن بێتە وولاتی مسوڵمانانەوە، زەوییەك كە زەوی موسڵمانانە داگیری بكات و دەسەڵاتی خۆی بەسەردا فەرزبكات، لەسەر مسوڵمانانی ئەو شوێنە -ئەگەر بەشی بكەن- ئەگەر نا لەسەر هەموو مسوڵمانانی دنیا فەرز دەبێ ئەو دوژمنە داگیركەرە لە وولات‌و خاكی خۆیان دەربكەن.

٣) كەخەلیفە (ئیمام وپێشەوا)ی مسوڵمانان (نفیر عام) واتە: حاڵەتی دەنگ دانی گشتی بۆ جیهادو جەنگ ڕابگەیەنێ.

لەم حاڵەتەشدا لەسەر هەموو مسوڵمانان دەبێتە (فرض العین) كەجیهاد بكەن.

---

(١) وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿... وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ (الأنفال: ١٦) كەواتە پشت لە دوژمن كردن بەهۆیەكی شەرعییەوە وەك تاكتیكی جەنگی یان پاڵدانە لای كۆمەڵێكی دیكەی مسوڵمانان ڕەوایەو هیچ ئیشكالێكی تێدا نیەو بگرە جاری وا هەیە فەرزیش دەبێ.



www.alibapir.net

ئەو پێناسەو تەعریفەی کە کردم (تقریباً) هەموو کتێبەکانی شەرع و قاموسەکانی زمان کە ئەوانیش هەموو زانایانی ئیسلام نووسیویانن وەکو: (القاموسُ المُحيْط و لِسانُ العَرَبْ و المِصْباحُ المُنير)ئەوانی تریش لەسەری ڕێك کەتوون، بۆ وێنە: کتێبی (النهاية في غريب الحديث والأثر)ی (إبن الأثير)، ئەو پێناسەیەی هێناوە، هەروەها (المُغْني)ی (إبن قُدامَة) کە کتێبێکی زۆر مەشهورە لە فیقهداو مەوسوعەیەکی گەورەیە، وە (إبن القَيِّم الجَوْزِيه) لە کتێبی (زادُ المَعَاد) دا بەهەمان شێوە باسیان کردوە.

## مانای جیهاد لە قورئان و سوننەتدا

هێندێك کەس (استدلال) دەکات بەهێندێك لە ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) لە غەیری شوێنی خۆیدا، بۆ نمونە: یەکێك دەیەوێ ئیسپاتی بکات کە جیهاد بەمەعنای (قتال) نیە، ئەو ئایەتە دەهێنێتەوە کە دەفەرمووێ: ﴿ وجاهدهم به جهاداً كبيرا ﴾ (الفرقان: ٥٢).

یەعنی: خوای گەورە بە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: جیهادێکی گەورە لەگەڵ موشریکەکاندا بکە بەهۆی قورئانەوە، دیارە جیهادێکیش بەقورئان بکرێت بریتی یە لە: جیهادی گفتوگۆو وتووێژو موناقەشەو (إقامة الحجة)یان ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێت: ((وجاهِدوا المُشْركين بِأَمْوالِكُمْ وأَنْفُسِكُمْ وألْسِنَتِكُمْ)) (رواه ابو داود وأحمد والدرامي والنسائي ووافقه الذهبي) [٢] واتە: دژ بەموشریکەکان تێ بکۆشن و

---

(٢) رياض الصالحين (ل: ٥١٥) تحقيق وتخريج شعيب الأرناؤوط.

www.alibapir.net

جیهاد بکەن بەماڵو دڵو زمانتان.

لەو ئایەت و فەرموودەیەی باسمان کردن کەگەلێك ئایەت وفەرموودەی دیکەش لەو بارەوە هەن ئەوە وەردەگیرێ کەلە قورئانو سوننەتدا ووشەی جیهاد مەعناو مەفهومەکەی فراوانترە لە (قتال) بەڵکو (قتال) یش واتە (جەنگ) و غەیری (قتال)یش دەگرێتەوە کەدەعوەو بانگ کردنە بۆ ئیسلامو موجادەلەو موناقەشە کردنو هەموو جۆرەکانی خەبات و تێکۆشانە لەپێناو خوای پەروەردگاردا.

بەڵام زانایانی شەرع ناس (الفقهاء) دەڵێن: (الْمُتَبادَرُ إِلىٰ الذِّهْنْ) واتە: ئەو مەعنایەی کە یەکسەر دێتە بیرو زەینی ئینسانەوە لە کاتێکدا ووشەی جیهاد دەگوترێ بریتی‌یە لە (قتال) چونکە لەزۆربەی ئایەتەکانی قورئانو فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دا جیهاد بەمانای (قتال) هاتووە ئینجا ئەگەر مەعنایی غەیری (قتال) یش دەگرێتە نێو خۆی، ئەوە (بالتبع)ە ئەگەر نا (بالأصالة) ڕاستەو خۆ مەعنای جیهاد (قتال)ە بەڵام غەیری (قتال)یش دەگرێتەوەو فراوانترە.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

www.alibapir.net

# دووەم: خۆئامادە کردن بۆ جیهاد و زەمینە سازی بۆ کردنی

مسـوڵمان دوو حاڵـەتی هـەن... یـان دەبێـت لەجیـهاد دا بێـت، یـان دەبێت خەریکی خۆ ئامادەکردن بێت بۆ جیهاد، ئەو مسوڵمانەی لەسەر ڕێبـازی پێغەمبـەر (ﷺ) دەڕوات و شـوێن پـێ ی هـاوەڵانی بـەڕێزی پێغەمبەری خوا (خوا لێ یان ڕازی بێت) هەڵدەگرێت، لەو دوو حاڵەتـە زیاتر سێ یەمیان نیە.

زانایـان لەسـەر ئـەوە (متفـق)ن یـەک دەنگـن کـە (إعـداد) خـۆ ئامادەکردن و کەل و پەل ئامادەکردن بۆ جیهاد فەرزە لەسەر مسوڵمانان چونکە زانایان بنەمایەکی (اصولی) یان داڕشتوە، کەئیجماعی لەسەرەو هەڵاواردن (استثناء)ی تێدا نیە، دەڵێن: (مـالایتم الواجـب الا بـە فهو واجب) واتە: (هەر شتێك واجبێك لەسەری پەکی کەوتبێت ئەو شتەش واجب دەبێت) بۆ نموونە: نوێژ بەبێ دەست نوێژ دروست نیە، بۆیە دەست نوێژیش واجبە، چونکـە نوێژەکـە بـەبێ دەسـت نوێـژ یـان بەدیلەکەی کە تەیمومە ناکرێت.

ئینجا بەبێ خۆ ئامادەکردنی هەمەلایەنەو جۆراو جۆر وەك: ئیمانی و مەعنەوی و عیلمـی و جەستـەیی و هونـەری و خۆئامـادەکردن لـەبواری هێزو ئامادەکردنی جۆرەکانی چەك و کەل و پەلی جەنگ و شارەزابوون و سەر ڕاست بوون لە بـەکارهێنانی چەك و پێداویستی یەکانی جەنگ، ئینسان ئەگـەر جیهادیشی لەسـەر فـەرز بێـت نایکات و بـۆی نـاکرێ، کەواتە وەکو چۆن جیهاد کردن فەڕزی کیفایەیە خۆئامادە کردنیش بۆ ئەو جیهادە کەبەبێ خۆئامادەکردن ناکرێ ئەمیش فەرزی کفایەیە.



www.alibapir.net

خوای کار بەجێ لە گەلێك ئایەتدا ئیشارەی بەو مەسەلەیە کردوەو تەصریحیشی پێ کردوە وەك دەفرمووێ:

﴿وأَعِدّوا لَهُم ما استَطَعتُم مِن قُوَّةٍ ومِن رِباطِ الخَيلِ تُرهِبونَ بِهِ عَدُوَّ اللهِ وَعَدُوَّكُم وآخَرينَ مِن دُونِهِم لا تَعلَمونَهُم اللهُ يَعلَمُهُم﴾ (الأنفال: ٦٠)..

واتە: ئەوەی لە تواناتان دا هەیە لەهێز بۆ دوژمنانتان -ئەهلی کوفر- ئامادەی بکەن وە لە ئەسپی چاك و ئامادەو بەستراوە -کەئێستا لەجێگەی ئەسپ سەیارەو دەبابەو مودەڕەعاتو ئەو شتانەی لەجێی ئەسپن دەگرێتەوە، وەچەکە پێشکەوتوەکان- ئەمەش بۆ ئەوەی ﴿تُرهِبونَ بِهِ عَدُوَّ اللهِ وَعَدُوَّكُم﴾ بەو هێزە کەئامادەتان کردوە دوژمنی خواو خۆتانی پێ بترسێنن.

## چەك و هێز بۆچی؟

مەرج نیە هەرکاتێك مسوڵمانان چەکیان پێ بوو و قوەتیان هەبوو یەکسەر لەئەهلی کوفر بدەنو هەڵکوتنە سەریان، بەڵکو لەڕاستیدا هەبوونی هێزو دەسەلاتو چەك بەدەستی مسوڵمانانەوە باشترین هۆیە بۆ ئەوەی ناحەزان شەڕ نەنێنەوەو مسوڵمانان شەڕیان پێ نەفرۆشرێ.

کاتێك مسوڵمانان وەك نێچیرێکی تووك نەرمو پاروویەکی سەهل بکەونە بەرچاو، ناحەزان تەماعیان تێ دەکەن، کێ هەیە شتی بێ دڕك حەز پێ نەکات تەنانەت ئەصحابیش کە خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرمووێ: ﴿ وَتَوَدّونَ أَنَّ غَيرَ ذاتِ الشَّوكَةِ تَكونُ لَكُم ﴾ (الأنفال: ٧) ..

واتە: دەتانویست ئەوەی بێ دڕكو ئازارە بۆ ئێوە بێت کە کاروانەکەیە - نەك جەنگو ڕوو بەڕوو بونەوە لەگەڵ (ابو جهل) وسوپاکەی کەلە (مەککە)وە بەنیازی شەڕ لەگەڵ مسوڵمانان هاتبوون کەئەم ئازاری پێوەیە.



www.alibapir.net

بەهەمان شێوە مسوڵمانانیش ئەگەر بێ درك و ئازارو بێ دەسەڵات بن هەموو کەس بەبێ تێوەڕامان تەماعیان تێ دەکات و ئەمەش دەبێتە هۆی شەڕو ئاشووب، بەڵام ئەگەر دەسەڵات و قوەتیان هەبێ هەر کەسێك بیەوێ شەڕیان لەگەڵ بکات، پێشەکی دەبێ حیساب و کتابێك بۆ خۆی بکات، کەواتە ئەگەر مسوڵمانان هێزو دەسەڵاتیان هەبێت دوژمنانیان بەپێی ئەو هێزە لێیان دەترسن و شەڕو ئاشووب لێیان بەدوور دەبێت، نەك بەپێچەوانەوە وەك خەڵکێکی سادەو فەقیرحاڵ بیر دەکەنەوە.

## خۆ ئامادەکرن بۆ جیهاد پێویستە

خوای گەورەو زاناو کاربەجێ لە سورەتی (توبة)دا سەبارەت بە کەسانێك کە بەعوزرو بیانووی جیا جیاوە خۆیان لە پێغەمبەر (ﷺ) دوا دەخست و نەدەچوون بۆ جەنگی (تبوك) دەفەرمووێ: ﴿ وَلَوْ أَرَادُوا الْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا لَهُ عُدَّةً وَلَكِنْ كَرِهَ اللَّهُ انْبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ اقْعُدُوا مَعَ الْقَاعِدِينَ ﴾ (التوبة: ٤٦).. یەعنی: ئەگەر ویستبایان بۆ دوژمنان دەربکەون وبچنە مەیدانی جیهادو جەنگ خۆیان بۆ ئامادە دەکردو پێداویستیەکانیان بۆ ئامادە دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی لەنیەت و دڵیاندا نەبوو جیهاد بکەن خۆیان بۆ ئامادە نەکرد.

خوای گەورەش دەفەرمووێ: ﴿ وَلَكِنْ كَرِهَ اللَّهُ انْبِعَاثَهُمْ ﴾ چونکە سەرو سینەیان لەگەڵ خواو ئیسلام تەواو نەبوو خوا -تبارك وتعالى- پێی ناخۆش بوو ئەوانە بێنە نێو ڕیزی مجاهیدانەوە ﴿ وَقِيلَ اقْعُدُوا مَعَ الْقَاعِدِينَ ﴾ بەزمانی حاڵ و مەقام پێیان گوترا دانیشن لەگەڵ دانیشتواندا، ئێوە پیاوی مەیدانی جەنگ و جیهادنین، ئەو مەیدانە پیاوی دەوێت، هەموو کەس شایستەی ئەوە نیە بچێتە نێو ئەو



www.alibapir.net

مەیدانەوە ئەگەر ئێوە بشچن لەجیاتی قازانج زەرەر بەمسوڵمانان دەگەیەنن.

وەك پێشتر باسمان کرد مسوڵمان دوو حاڵەتی هەیە: یان لە حاڵەتی غەزاو جەنگ‌و جیهاد دایە، یان لە حاڵەتی خۆ ئامادە کردندایە، وەکو ئەم ئایەتانە دەیگەیەنن کە باس کران، پێغەمبەریش (ﷺ) لە فەرموودەیەکی (صحیح)ی خۆیدا دەفەرمووێ: (مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ وَلَمْ يُحَدِّثْ نَفْسَهُ بِغَزْوٍ مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ النِّفَاقِ) (رواه مسلم). (٣)

واتە: هەرکەسێك بمرێ‌و غەزا نەکات بەتەماش نەبێت بیکات‌و لەدڵیدا نەبێ‌و خۆی بۆ ئامادە نەکردبێ‌و زەمینەسازی نەکات بۆ ئەوەی جیهادو (قتال) بێتە پێش بەتایبەتی لەکاتێکدا کە ئیسلام سەرکوت دەکرێ، مسوڵمانان دادەپڵۆسێنرێن لە کاتێکدا کە ئاڵای (لاإله إلا الله محمد رسول الله) بەبێ نازی دەکەوێ، شەریعەتی خوا حوکمی پێ ناکرێت، ئەگەر کەسێك هەبێ نەلە مەیدانی غەزادا بێت‌و نە بەتەماش بێت بیکات‌و بمرێ ئەوە لەسەر بەشێك لەبەشەکانی نیفاق‌و دەغەڵی مردوە، خوا پەنامان بدات. (٤)

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

---

(٣) بڕوانە رياض الصالحين (ل ٥١٢) تحقيق وتخريج شعيب الأرناؤوط.

(٤) ئەمە فەرموودەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) نەك قسەو پڕوپاگەندەی (بزوتنەوەی ئیسلامی) وەك هەندێك لە مسوڵمانان‌و زۆرێك لە دوژمن‌و ناحەزانی کافرو دەغەڵ دەڵێن‌و هەمیشە بەچاوی رەخنەو تۆمەتبار کردن‌و لەپشت پەردەی رەشەوە تەماشای دەکەن.



www.alibapir.net

# سێیەم: جۆرەکانی جیهاد

**جیهاد دووبەشە:**

***(١) جیهادی دەفع وەکو (فقهاء) شەرع زانان وایان ناو لێ ناوە، واتە: جیهادی بەرپەرچ دانەوە.***

***(٢) جیهادی (طلب) واتە: هێرش بردنە سەر دوژمن.***

بەڵام بەداخەوە ئەم مەسەلەیە -کە جیهاد دووبەشە- هەم بەرپەرچ دانەوەی هێرشی دوژمنانو هەم پەلاماردانو هێرش بردنە سەر دوژمنانێك کە حوکم بەشەریعەتی خوا ناکەنو ورێنگایش دەگرن لەوەی کە دینی خوای (تبارك وتعالى) بگاتە عەبدەکانی خوا زۆر شێوێنراوە، نەك هەر بەدەستی کوفر بگرە بەدەستی ئەهلی ئیسلامیش زوڵمی لێ کراوە!!

هەندێك کەس لەناحەزانی دینو دوژمنانی ئیسلام بۆ ئەوەی ڕوحی جیهادو بەرەنگاری لە مسوڵمانان‌دا بمرێننو وبیانخەسێنن ئەولایان لێ دەگرنەوەو دەڵێن: (ئیسلام دینی د ڕندایەتیەو بەشیرو تیر بڵاو بۆتەوەو بەزۆر بەسەر خەڵکیدا فەرز کراوە!!) بۆ ئەوەی هێندێك لەمسوڵمانانیش لە (رد الفعل) کاردانەوەدا بڵێن: (نەخێر نەك ئیسلام هەر بەزۆر نەسەپێنراوەبەڵکو ئیسلام بڕوای بەشەڕی هجوومی هەر نیەو لە بەرامبەر دوژمناندا هێز هەر بەکار ناهێنێت، مەگەر دەست درێژی بکرێتە سەرو تەعدای لێ بکرێت!!) کە بێگومان هەم قسەی دوژمنانی دین هەڵەیەو هەم قسەی ئەوانەی بەحیساب دیفاعیش لەدین دەکەن **ڕاست نیە، هەردوکیان غەڵەتن یەکیان ئیفراطی کردوەو ئەویتریشیان**



www.alibapir.net

تفریطی کردوه، یەکیان تێ ی پەڕاندوەو ئەوی تریش کورتی هێناوە بەڵکو حەقیقەتی جیهاد بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١-جیهادی بەرگری (جهاد الدفع) کە بریتییە لەبەر پەرچ دانەوەی هێرش و پەلاماری دوژمنان لەکاتێکدا هێرش دەهێننە سەر ئیسلام و خاکی مسوڵمانان و سەر کیان و بوونی مسوڵمانان، جا چ مسوڵمانان کیان و بوونێکیان هەبێت، خاکیان بەدەستی خۆیانەوە بێت چ وانەبن و لە حاڵەتی کۆمەڵگایەکی بێ دەسەڵاتدا بن کەحوکمی ئیسلامی بەسەرەوە نەبێت، لەهەردوو حاڵەتدا حاڵەتی هەبوونی کیان و دەسەڵاتی ئیسلامی و نەبوونی کیان و دەسەڵاتی ئیسلامی‌دا، مسوڵمانان مولزەمن بەوەی بەپێ ی توانا دیفاع لە دینی خواو (حرمات)ی دینی خواو شەعائری دین بکەن و واجبە دیفاع لە موقەدەساتی ئیسلام و کیانو بوونی خۆیان بکەن، کەچەندان ئایەت دەلالەتی لەسەر دەکەن بۆ وێنە خوای دادگەر دەفەرمووێ: ﴿وقاتِلُوا في سَبِيلِ اللهِ الَّذِينَ يُقَاتِلونَكُمْ﴾ (البقرة: ١٩٤).. هەر کەسێك دەست درێژی کردنە سەر، ئێوەش دەست درێژی بکەنەوە سەری و بەرپەرچی تەعداو دەست درێژی‌یەکەی بدەنەوەو زوڵم و تەعدا قبوڵ مەکەن. ((لايَنْبَغِيْ لِلْمُؤْمِنِ أَنْ يُذِلَّ نَفْسَهُ)) ئیماندار بۆی نیە خۆی زەلیل و زەبوون بکات بەدەستی دوژمنانەوە مادام لە توانای‌دا هەیە، خۆ ئەگەر لەتوانای‌دا نەبوو زەلیل کراو زەبوونیان کرد ئەوە گوناهبار نیە..

٢-جیهادی هێرش بردن (جهاد الطلب) کە بریتییە لەوەی ئەهلی ئیمان هێرش بکەنە سەر دوژمنان، ئەوەش گەلێك ئایەت بەتایبەتی ئەو ئایەتانەی کەلە دوا دوای تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوونەتە خوارێ دەلالەتی لەسەر دەکەن، لەیەکێك لەوئایەتانەدا خوای (تبارك وتعالى)



www.alibapir.net

دەفەرمووێ: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾(الانفال: ٣٩)

واتە: لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا بجەنگن تاکو فیتنە نامینێ، توێژەرەوانی قورئان فیتنەیان بە (شرك) لێك داوەتەوەو بە چەوساندنەوەی مسوڵمانانیشیان لێك داوەتەوە. لەئەسڵدا ووشەی (فتنة)بەوە دەگوترێ کە زێڕنگەر زێڕەکەی لەسەر ئاگر گەرم دەکات و قاڵی دەکاتەوە، بۆ ئەوەی زێڕی خاڵص لەو ماددەو مەعدەنانەی کە لەگەڵی تێکەڵ کراون لێك جیا بکاتەوە، لەوەوە وشەکە وەرگیراوە بۆ هەر جۆرە ئەشکەنجەو ئازاردانێك، کەواتە: لەگەڵ دوژمنانتان بجەنگن تا توانای چەوساندنەوەی مسوڵمانانیان نامێنێ، هەتا توانایان نامێنێت ڕێگا لە ڕەعیەتو خەڵکەکەی خۆیان بگرن کە مسوڵمان ببن.

دەبێت مسوڵمانان جیهادو (قتال) بکەن لەگەڵ دوژمنانیاندا هەتا دەسەڵاتی ئیسلام لە هەموو دنیادا فەرمانڕەوا دەبێت، بەشێوەیەك کە نەهیچ مسوڵمانێك بەزۆر لە دینەکەی هەڵبگەڕێنرێتەوەو نەهیچ کافرو موشریکێش ناچار بکرێت لەسەر شیرك و کوفری خۆی بمێنێتەوەو نەهێڵن مسوڵمان ببێت‌و ڕێگای هیدایەتی خوای لێ بگرن لە چاڵی دینی بەتاڵ‌و زەلکاوی گومڕاییدا دیل‌و زەلیلی بکەن.

ameer.maktab@yahoo.com


/AliBapir

/AliBapir

/MediaAmeerOffice

www.alibapir.net



www.alibapir.net

# ماناى : لاإِكْراهَ في الدِّين

خوای‌كاربەجێ دەفەرمووێ: ﴿ لاإِكْراهَ فِي الدِّين قَدْ تَبيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الغَيِّ ﴾ (البقرة: ٢٥٥).. واتە: تۆبزى كردن‌و ناچار كردن نیە لە وەرگرتنى دیندا، ئەمە لەكاتێكدا چەوت‌و ڕاستى لە یەكترى جیا بووبنەوەو ئیسلام بگاتە هەموو كەسێك‌و بەئازادى بتوانێ ئیمانى پێ بێنێ یان پێى نەهێنێ، ئەوكاتە زۆرو قوەت و دەستەلأت بەكار ناهێنرێ، ئەم زۆرو دەستەلأت‌و هێزە لە كاتێكدا بەكار دەهێنرێ كە سەنگەر لەئیسلام گیرابێ‌و لەمپەرو كۆسپ‌و پەرچ‌و ڕێگر خرابێتە بەردەم ئیسلام‌و نەهێڵن بگاتە گوێى خەڵك، بەڵێ لەو كاتەدا ئیسلام قوەت بەكار دێنێ و دەجەنگێ بەڵام نەك بۆ ئەوەى خەڵك مسوڵمان بێت، بەڵكو بۆ ئەوەى ئەو پەرچ‌و لەمپەرەى كە ڕێگەى لەخەڵك گرتوە گوێ بیستى بانگى حەق بێ، لابچێت، كەواتە ئیسلام قوەت بەكاردێنێ بۆ ڕێگا كردنەوەو تەخت كردن نەك خەڵك بەزۆرەملێ مسوڵمان كردن.

چونكە دیندارى‌و مسوڵمانەتى قەناعەت‌و پەیوەندى بەدڵ‌و عەقڵەوە هەیە، كەسێك دینى نەچووبێتەوە دڵ وعەقڵەوە ئەگەر هەزار نوێژ‌و ڕۆژوو بكات خوا لێى وەرناگیرێت‌و تەنانەت مسوڵمانیش ئەگەر بەقەلب‌و قەناعەتى خۆى نوێژ نەكات‌و عیبادەت نەكات، ئەوا بەڕیاو نیفاق بۆى لەقەڵەم دەدرێ، كەواتە ئیسلام قوەت بەكار دێنێت بۆ بەڵام نەك بۆ ئەوەى خەڵك مسوڵمان بێت، بەڵكو بۆ ئەوەى خەڵك مەجالى هەبێت مسوڵمان ببێت، جا ئەگەر مسوڵمان بوو باشە، ئەگەر مسوڵمانیش نەبوو كەیفى خۆیەتى ﴿ لاإِكْراهَ فِي الدِّيْن ﴾وە ﴿ فَمَنْ شاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شاءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ (الكهف: ٢٩).. كێ حەز دەكات بائیمان بێنێ‌و



www.alibapir.net

کێ حەز دەکات با کافر بێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە کافرێك بێت لەماڵی خۆیداو دژایەتی ئیسلام نەکات.

ئەوەی باسم کرد لەزۆر ئایەتی قورئانو فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ) دا هاتوە، وەك لەحەدیسێکی پێغەمبەر (ﷺ) دا بەم شێوەیە هاتوە: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إذا أَمَّرَ أَمِيراً عَلَى جَيْشٍ أَو سَرِيَةٍ أَوْ صَاهُ فِي خَاصَّتِهِ بِتَقْوَى اللهِ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْراً ثُمَّ قَالَ: أُغْزُوا بِاسْمِ اللهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللهِ، أُغْزُوا وَلا تَغُلُّوا ولاتَغْدِرُوا وَلاتُمَثِّلُوا ولا تَقْتُلُوا وَلِيْداً، وإذا لَقِيْتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إلَى ثَلاثِ خِصَالٍ فَأَيَّتُهُنَّ مَا أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ: أُدْعُهُمْ إلَى الإسْلام فَإنْ هُمْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وكُفَّ عَنْهُمْ فَإنْ هُمْ أَبَوا فَسَلْهُمُ الجِزْيَةَ، فَإنْ هُمْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، فَإنْ هُمْ أَبَوا فَاسْتَعِنْ بِاللهِ وَقَاتِلْهُمْ)) (رواه مسلم).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) کەیەکێکی دەکردە فەرماندە بۆ سوپایەك یاخود بۆ سریەیەك فەرمانی پێ دەکرد کەخۆی بەتەقوا بێ وئاگای لەمسوڵمانان بێو مشووریان بخوات، دوایی دەیفەرموو: (اغزوا باسم الله وفي سبيل الله قاتلوا من كفر بالله اغزوا ولاتغلوا ولا تغدروا ولا تمثلوا ولا تقتلوا وليداً) یەعنی: غەزا بکەن بەناوی خوا لەپێناوی خوادا، بجەنگن لەگەڵ ئەوانەدا کە بڕوایان بەخوانیە، غەزا بکەنو لە غەنیمەت دزی مەکەن وەغەدرو پەیمان شکێنیش مەکەن لەگەڵ دوژمناندا، وەئەگەر یەکێکتان کوشت ئیهانەی پێ مەکەنو لوتو گوێی مەبڕن وەمنداڵ مەکوژن -لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێ ئافرەتیش مەکوژن- (وإذا لقيت عدوك من المشركين فادعهم إلى ثلاث خصال)ئەگەر گەیشتیت بەدوژمنەکەت لەمشریکەکان بانگیان بکە بۆ سێ شتان (فأيتهنّما أجابوك فاقبل منهم وكف عنهم) وەڵامی هەر کامیان دایەوە لێیان وەرگرەو وازیان لێ بێنە:-



www.alibapir.net

١-(أدعهم إلى الإسلام فان هم اجابوك فاقبل منهم وكف عنهم) بانگیان بکە بۆ ئیسلام ئەگەر مسوڵمان بوون لێیان قبوڵ بکەو دەستیان لێ بپارێزە.

٢- ((فأن هم ابوا فسلهم الجزية فان هم اجابوك فاقبل منهم وكف عنهم)) ئەگەر مسوڵمانان نەبوون داوایان لێ بکە جزیە -سەرانە- بدەن، ئەگەر جزیەیان دا لێیان قبوڵ بکەو دەستیان لێ بپارێزەو وازیان لێ بێنە.

[جزیە -سەرانە- ئەندازەیەك ماڵە لەلایەن ئەو کەسانەوە کە مسوڵمان نابن‌و لە وڵاتی مسوڵماندا دەژین‌و لەسەر دینی خۆیان دەمێننەوە، دەدرێت بەدەوڵەتی ئیسلامی، جا ئەوانە (مشرك) بن یا جولەکە یا مەسیحی بەپێی ئەم فەرموودەیە کە دەفەرمووێ: (وإذا لقيت عدوك من المشركين)[٥]]

٣- ((فأن هم ابوا فاستعن بالله وقاتلهم)) ئەگەر جزیە -سەرانە- شیان نەدا داوای یارمەتی لە خوا بکەو لەگەڵیان بجەنگە.

کەواتە ئیسلام دینی خوایە، بۆ هەموو بەندەکانی خوا لەسەر زەوی خواو نەبەستراوەتەوە بەشوێن‌وکات ومیللەتێکی تایبەتی‌یەوە.

---

(٥) هەندێك لە زانایان دەڵێن: تەنها (اهل الكتاب) بۆیان هەیە لەسەر دینی خۆیان بمیننەوەو (جزیە) بدەن، بەڵام کۆمەڵێکی تر کەقسەکەیان بەهێزترەو ئەم (حديث)ەش پشتگیریان دەکات، دەڵێن: هەموو خاوەن دین‌و فیکرەیەك بۆی هەیە لەسەر فیکرەو بەرنامەو دینی خۆی بمێنێتەوە، بەمەرجێك جزیە، -سەرانە- بدات، چونکە حەدیسەکە دەفەرمووێ: ((فإن هم اجابوك فاقبل منهم وكف عنهم)) یەعنی ئەگەر ئامادەبوون سەرانە بدەن بامسوڵمانیش نەبن لێیان قبوڵ بکەو دەستیان لێ بپارێزەو لێیان گەڕێ ئەم سەرانەیەش مانای مل کەچی یان بۆ دەسەڵاتی ئیسلامی دەگەیەنێ. هەروەها مەجووسی‌یەکانیش چونکە پێغەمبەر (ﷺ) کەلە بارەیانەوە پرسیاری لێ کراوە فەرموویەتی: (سنوا بهم سنة اهل الكتاب...) واتە: وەك ئەهلی کیتاب (اليهود والنصارى) ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن ئەوەندە هەیە ژنیان لێ ناهێنرێ‌و سەربڕاویان ناخورێ.



www.alibapir.net

## تێبینی:

سەرانە وەرگرتنیش لەوانەی مسوڵمان نابن و لەسەر دینی خۆیان دەمێننەوە و لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژین، لە بەرامبەری ئەوەدایە کە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا لەسەر مسوڵمانان فەرزە سەربازیی بۆ بکەن و بچنە جیهادو حوکم و بانگەوازی ئیسلامی بپارێزن، بەڵام ئەوەی مسوڵمان نەبێ، سەربازی ناکاو جیهادی لەسەر فەرز نیە، چونکە جیهادیش وەکو نوێژو ڕۆژوو عیبادەتەو وەك چۆن پێیان ناگوترێ نوێژ بکەن، بەهەمان شێوەش پێیان ناوترێ جیهاد بکەن.

ئینجا دەوڵەتی ئیسلامی خزمەتیان دەکات و نەفس و ماڵ و ناموسیان دەپارێزێ بەڵکو پەرستگاکانیشیان دەپارێزێ و کەس بۆی نیە بەهیچ جۆرێك و لەهیچ ڕوویەکەوە دەست درێژی بکاتە سەریان،بۆیە لەبەرامبەر ئەو هەموو خزمەتانەی کە دەوڵەتی ئیسلامی پێشکەشیان دەکات پێویستە ئەوانیش خزمەتێکی دەوڵەت بکەن کەوەك چۆن مسوڵمانان زەکات دەدەن ئەوانیش ساڵانە ئەندازەیەك ماڵ بدەنە دەوڵەت، ئەمە پڕە لەعەدالەت و دادپەروەری کەلە دنیادا یاسای لەوە دادپەروەرانەتر نیە، لە بواری هەڵس و کەوت و ڕەفتاری لەگەڵ کەسانێکدا لە ژێر سایەشیدا دەژین و هەموو هەقێکیشیان بۆ دابین دەکرێ و دەپارێزرێ.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net



www.alibapir.net

# چوارەم: قۆناغەكانی جیهاد

پلە پلەیی (التَدَرُّج) لە یاساكانی شەرع (الأَحكام الشرعية)دا بەهەردووك جۆری (الأوامر والنواهي) واتە: فەرمان پێكراو و نەهی لێ كراوەكان، وەرەچاوكردنی واقیعی كۆمەڵی مسوڵمان و تواناو بڕستی بۆ ڕاپەراندنی ئەرك و كارەكانی سەرشانی، دوو بنەمای گەورەن لەشەریعەتی خوادا، چونكە شتێكی ئاشكراو ڕوونە كە ناكرێ و ناگونجێ یەك تەكان و بەیەك جارو لەیەك حاڵ و قۆناغدا هەموو ئەرك و كارەكان جێ بەجێ بكرێن، لەسۆنگەی ئەمەوە جیهادیش لەڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بە سێ قۆناغ فەرز كراوە، كەئەمانەن:-

١- مۆڵەت دران بەجەنگ و بەرگری لە خۆكردن (الأذن بالقتال والدفاع) بۆ وێنە: خوای دادگەرو كاربەجێ لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ (الحج: ٣٩).. واتە: مۆڵەت دروا ئیجازە درا بەوانەی كە شەڕیان پێ دەفرۆشرێ كە بجەنگن و دیفاع لە خۆیان بكەن، لەبەر ئەوەی زوڵمیان لێ كراوەو هەقیان داگیرو زەوت كراوە، وەبێگومان خوای -تبارك وتعالى- لەسەر پشتگیری كردن و سەرخستنیان بەتوانایە. كەواتە لەم قۆناغی یەكەم و سەرەتایەدا جەنگ كردن فەرز نەكراوە بەڵكو تەنها مۆڵەت وئیجازە بەمسوڵمانان دراوە كەبەرگری لە خۆیان و موڵك و ماڵیان بكەن و كەپێشتر پێیان دەگوترا: ﴿كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ (النساء: ٧٧).. واتە: دەستتان بپارێزن لەدوژمنانتان و سەرگەرمی نوێژ بەرپاكردن و زەكات دان بن.(٦)

---

(٦) زۆر لەزاناو توێژەرەوانی قورئانی ڕایان وایە كە لێرەدا مەبەست لە (زەكات) تەزكیەی نەفسە چونكە زەكات دان لەمەدینە فەرز بووە، وئەم ئایەتەش باسی حاڵ و باڵی مسوڵمانان دەكات لە قۆناغی ژیانیان لە مەككەدا.



www.alibapir.net

ئێستا پێشگیرییان لێ ناکرێو رێگایان پێ دراوه کەچی پێیان دەکرێ بیکەن لەبواری تۆڵەستاندنەوەو بەرگری لە خۆکردندا.

٢- جەنگ کردن لەگەڵ ئەوانەدا کەشەڕیان پێ دەفرۆشنو وازهێنان لەوانەی دیکە کە دژایەتی ناکەنو بێ لایەنی پێشان دەدەن، وەك خوای تۆڵەسێن فەرموویەتی: ﴿وقاتِلوا في سَبيلِ اللهِ الّذينَ يُقاتِلونَكُمْ ولاتَعْتَدوا إنّ اللهَ لايُحِبُّ المُعْتَدينَ﴾ (البقرة: ١٩٠)..واتە: لە پێناوی خوادا لەگەڵ ئەوانەدا بجەنگن، کە لە [illegible] لەگەڵتان دەجەنگن بەڵام دەست درێژی مەکەن چونکە خوا دەستدرێژکارانی خۆش ناوێ، کەواتە لەم قۆناغەدا جیهاد فەڕزکراوە، بەڵام تەنها بەجۆرێك فەڕز کراوە کەشەرع زانان پێی دەڵێن: (جهاد الدفع) واتە: جیهادی بەرپەرچ دانەوەو لەو حاڵەدا هەر ئەوەندەیان لەبرستو توانادا بووە، نەك وەك کەسانێك بیر دەکەنەوە کە جیهاد هەر ئەوەندەو بەس ئەم جۆرە بێ!.

٣- جەنگ کردن لەگەڵ تێکڕاو سەرجەمی کافرو موشریکەکاندا بەبێ هەڵاواردن، وەك خوای بەتوانا فەرموویەتی: ﴿وقاتِلوا المُشْرِكينَ كافّةً كَما يُقاتِلونَكُمْ كافّةً﴾ (التوبة: ٣٦).. واتە: لەگەڵ تێکڕای هاوبەش پەیدا کەراندا بجەنگن وەك چۆن تێکڕاو بەهەموویان لەگەڵتان دەجەنگن، هەروەها فەرموویەتی: ﴿وقاتِلوهُمْ حَتّى لاتَكونَ فِتْنَةٌ وَيَكونَ الدّينُ كُلُّهُ لِلّهِ﴾ (الأنفال: ٣٩).. پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموویەتی: (أُمِرْتُ أنْ أُقاتِلَ النّاسَ حَتّى يَشْهَدوا أن لاإلٰهَ إلاّ اللّهُ وأنّ مُحَمَّداً رَسولُ اللهِ ويُقيموا الصّلاةَ ويُؤْتوا الزّكاةَ فإذا فَعَلوا ذلِكَ عَصَموا مِنّي دِماءَهُمْ وأموالَهُمْ إلاّ بِحَقِّ الإسْلامِ وحِسابُهُمْ عَلىٰ اللهِ) (رواه البخاري ومسلم)..واتە: فەرمانم پێ کراوە کە لەگەڵ خەڵکی -نامسوڵمان-دا بجەنگم هەتا شایەتمان



www.alibapir.net

دێنن، کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، وە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، وەنوێژ بەرپا بکەنو زەکاتیّ بدەن، جا ئەگەر ئەوەیان کرد ئەوە خوێنو ماڵیان لەمن پاراستوە مەگەر بەهەقی ئیسلام وەلێپرسینەوەیان عایدی خوایە.(٧)

ameer.maktab@yahoo.com

/AliBapir

/AliBapir

/MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

---

(٧) لەم فەرموودەیەدا وا دەردەکەویّ کە پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکی ناچار کردبێت لەنێوان مسوڵمان بوونو جەنگ کردندا یەکێکیان هەڵبژێرنو ڕێگەی دیکەی سێیەمیان بۆ نەماوەتەوە! بەڵام لەڕاستیدا وانیە، وەك لە فەرموودەکانی دیکەی پێغەمبەردا هاتوەو لەسیرەو ژیانی کردەیشیدا دەردەکەویّ بۆ نموونە فەرموویەتی: (وإذا لقيت عدوك من المشركين فادعهم إلى ثلاث خصال...) کە پێشتر مانامان لێك داوەتەوە.

دیارە بۆ وەرگرتنی حوکمێکی شەرعیش لە هەر ڕوویەکەوە بیّ، نابیّ بەتەنیا پشت بەدەقێك ببەستینو پێویستە هەموو ئەو دەقە شەرعیانەی کە لەو بارەوە هاتوون ڕەچاویان بکەین، بۆ ئەوەی دووچاری هەڵەی سەیرو سەمەرە نەبین، کە بەداخەوە هێندێك لە برا گەنجەکانمان لەبەر کەم شارەزاییو دڵگەرمیو کەم تەجرەبەیی گیرۆدەی ئەم جۆرە هەڵانە بوونو دەبن، بگرە هەندێك لەوانەش کە خۆیان بەزاناو شارەزاش دادەنێن ئەو جۆرە حاڵەتەیان هەیە.



www.alibapir.net

# پێنجەم: پێداویستی‌یەکان (مستلزمات)ی جیهاد

پێشەکی ئایا جیهاد بەهەموو کەس دەکرێت وە لەهەموو حالاَندا دەکرێت؟ بێگومان نە ء،بەڵکو جیهاد بەکۆمەڵێکی تایبەتی‌و هەڵبژاردە دەکرێ‌و جیهاد (بدیل) نیە بۆ وەرگرتنی عیلم‌و زانستی شەرعی‌و شارەزا بوون لە قورئان‌و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) و کەس بۆی نیە بڵێ: واز لە فێربوونی زانستە شەرعیەکان دێنم‌و چەك هەڵدەگرم‌و سەنگەر دەگرم‌و بەس، وەجیهادو جەنگ لەپێناوی خوادا بەدیل نیە بۆ تەقواو بانگەوازو تەزکیەی نەفس، بەڵکو تەواوکەری هەموو ئەوانەیەو چڵەپۆپەی هەموویانە. وەبەڕاستی کەسێك جەنگ‌و وجیهادی پێ دەکرێ کە خاوەنی عیلم و تەقواو عیبادەت‌و کردەوەی باش‌و خەسڵەتە بەرزو پەسەندەکان بێت وەك: (صبر)و (شكر)و (يقين)و (توكل)و خۆشەویستی خواو پێغەمبەر (ﷺ) وباقی سیفەتە بەرزو پەسەندەکان، خوای کاربەجێ لە سورەتی (التوبة) دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَىٰ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ ﴾ (التوبة: ١١).. واتە: خوا گیان‌و سامانی لە بڕواداران کڕیوە کە بەهەشتیان بداتێ، لەڕێی خوادا دەجەنگن، دەکوژن‌و دەکوژرێن.. دوای ئەم ئایەتە دەفەرمووێ: ﴿ التائبون ، العابدون، الحامدون، السائحون، الراكعون الساجدون، الآمِرونَ بالمعروف والنّاهون عَن المُنكَر والحافظون لِحُدُودِ اللهِ وبَشّرِ المؤمنين ﴾ (التوبة: ١١٢).. نۆ سیفەتی سەرەکی لە ئیمانداراندا باس دەکات. یەعنی: ئیماندارانێك خوای میهرەبان گیان‌و وسامانی لێ کڕیون‌و لە پێناوی خوادا دەجەنگن‌و دەتوانن دینی خوا بەرز بکەنەوە کە ئەو (٩) سیفەتەیان تێدا بن:



www.alibapir.net

١-٢ (التائبون، العابدون) تۆبەکەران، خواپەرستان.
٣-٤ (الحامدون السائحون) سوپاس‌و ستایش کەران بۆ خوا، ڕۆژوگران، یان گەشت کەران.
٥-٦ (الراکعون الساجدون) ڕکوع بەران، کڕنووش بەران.
٧-٨ (الآمِرون بالمعروف والناهون عن المنکر) فەرمان کەران بەچاکە وڕێگران لەخراپە.
٩- (والحافظون لحدود الله) وەپارێزەرانی سنوورەکانی بەرنامەی خوا.

کەواتە کەسانێك دەتوانن لەڕێی خوادا جیهاد بکەن‌و جیهادەکەشیان جێی خۆی بگرێت، کە خۆیان بەم سیفەتە بەرزانە ڕازاندبێتەوە، ئەگەر نا کەسێك هەموو پشك وبەشی لەئیسلامدا بریتی بێ لە (چەکێك)و ڕیشێکی جوان، کەبێگومان ڕیشی بێ ئیش‌و وچەکی بێ تەقواو علم‌و وتەزکیەو ئەوسیفەتە بەرزانەی تر کەلە قورئان‌و سووننەتدا باس کراون، بەتەنیا هیچیان بۆ ئیسلام پێ ناکرێ، ئەوە پیاوی وا هەرچەندە زۆر لەخۆی ڕاببینێ کاتێك لاوازی‌و دەستەپاچەیی خۆی دەزانێ، کە دەچێتە مەیدانێ، وەکو شاعیر دەڵێ:

سَوْفَ تَرىٰ إِذا انْجَلىٰ الغُبارُ        أَفَرَسٌ تَحْتَكَ أَمْ حِمارُ *

پێداویستیەکانی جیهادیش بریتین لە پەروەردە بوون وبار هێنران‌و پێگەیاندرانی کۆمەڵێك موجاهید کە ڕازاندرابێتەوە بەهەموو سیفەتە بەرزەکان لە:
ا) ئیمانی دامەزراوو پتەو.
ب) تێگەیشتنی ڕاست‌و دروست لە قورئان‌و سووننەت.
ج) عیبادەتی ساغ‌و دوور لە بیدعەت.
د) ڕەوشت‌و خووی بەرزو جوانی ئیسلامی.
و) سیفەتی جەنگاوەری‌و شارەزایی هەبوون لە هونەرەکانی جەنگ‌و کوشتار..

---

* واتە: پاشان کە تۆزو خۆڵ نیشتەوەو نەما...دەبینی داخوا کەرسواری یان ئەسپ سوار!!.


www.alibapir.net

## شەشەم: ئامانجی جیهاد

هێندێك كەس پێیان وایە هەر كە ئیسلامی‌یەكان چەكیان هەڵگرت بۆ ئەوەیە خەڵكی بەزۆر پێ مسوڵمان بكەن ئەگەرنا بیانكوژن,كە ئەمە تۆمەتێكی ناڕەوایە بۆ ئیسلامیەكان‌و ئیسلامیش بەگشتی هەڵدەبەسترێ، وەبەداخەوە هەندێك لە مسوڵمانانیش لە ژێر فشارو تینی ئەو پڕوپاگەندە ناحەزانەیەدا خۆیان لە دەست دەدەن‌و زەلیلانەو بێ دەستەڵاتانە دیفاع لە ئیسلام دەكەن‌و دەیانەوێ هەرچی زبری‌و دڕك‌و هێزو پێز هەیە لە ئیسلامی داڕنن‌و بۆ ئەوەی كەس گلەیی‌یان لێ‌نەكات ئیسلام سپی بكەن‌و وەك‌هێلكە بیخەنە بەر دەستی ئەهلی كوفر! وە بڵێن: ئیسلام نەك هەر زبر نیەو دڕكی پێوە نیە، بەڵكو وەك هێلكەی سپی كراو وایەو نەرم‌و نۆڵەو هەر توێكڵیشی نیە! ئەمە كەوتنە تەڵەو داوی دوژمنانە، هەر لەسەرەتاشەوە كە دوژمنان دەڵێن: ئیسلام بەزەبرو زەنگ فەرز دەكرێ‌و دڕندایەتی‌یەو خەڵك بەناهەق دەكوژێ هەر بۆ ئەوەیانە هێندێك لە مسوڵمانان تووشی ئەم هەڵەیە بن‌و لە (رد فعل) كاردانەوەی قسەكانیاندا بڵێن: لە ئیسلامدا چەك وهێز نیەو ئیسلام دژی جەنگەو نابێ تەنانەت چەقۆشت پێ بێ!! لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بەكتێبێك بكەم كە یەكێك لە نووسەرە ئیسلامی‌یەكان نووسیویەتی بەناوی (الجهادُ فِي الإسلامِ كَيْفَ نَفْهَمُهُ وكيف نُمارِسُهُ) ئەویش هی (دكتور محمد سعيد رمضان البوطي)یە كە بەڕاستی ناوبراو كۆمەڵە كتێبێكی باشی هەن، بەڵام دیارە هیچ كەسیش بێ هەڵەو كەم‌و كوڕی نابێ، كە بەداخەوە ناوبراو لەو كتێبەی‌دا زۆر شتی هەڵەو بێ جێی نوسیوە، لێرەدا ئاماژە بەیەك شت دەكەم ئەویش ئەوەیە كە دەڵێ: هۆی



www.alibapir.net

فەرزکرانی جیهادو جەنگ بریتی‌یە لە بەرپەرچ دانەوەی هێرشی دوژمنان، بەو تێ گەیشتنەی ئەوبێت جیهاد لە ئیسلامدا تەنیا جیهادی (دفع)ە وجیهادی (طلب)نیە، وەهەر کاتێك ئەهلی کوفر هێرش نەکەنە سەر مسوڵمانانو وڵاتی مسوڵمانان، ئەوە بۆ خۆیان ئازادن چی دەکەن بیکەن ! کەبێ گومان شتێکی هەڵەیە، ئینجا ناوبراو دوو مەسەلەی تێکەڵ بەیەکتری کردوە کە زۆر لە یەکتری جیاوازن، مەسەلەی هۆی تەشریع بوونی جیهاد، لەگەڵ ئەوەی کاتێك سوپای ئیسلام لەگەڵ سوپای کوفردا ڕووبەڕووی یەکتری دەبنەوەو جەنگ دەکەن ئایا عیللەتو هۆی کوشتنی کافرەکە لەلایەن مسوڵمانانەوە، کوفرەکەیتی یاخود دژایەتی یەکەیەتی بۆ ئیسلام، بێ گومان جگە لە نووسەری ناوبراویش کە هەموو جیهاد کورت هەڵدێنێ لە جیهادی دیفاعی‌دا، خەڵکی تریش لێرەو لەوێ‌قسەی لەو بابەتانە دەکەن کە ئێمە نامانەوێ باسیان بکەین، بەڵام وەکو ڕوون کردنەوەی حەقیقەتو واقیع دەڵێین: بەڕاستی ئەگەر زۆر لە خۆمان وریا نەبین دوژمنانی ئیسلام دەمانخەنە سەد تەڵەو داوی ئاواوە، بۆ نموونە: کە دەڵێن: دیموکراسیەت شتێکی پێوستە بۆ ژیانو ڕەواجی پێ دەدەنو واخەڵکی تێدەگەیەنن کە هەر کەسێك بڕوای بەدیموکراسیەت نەبێو پێی ڕازی نەبێ و لەژێر سایەی‌دا نەژی، هەر مرۆڤیش نیە، بەداخەوە هێندێك لەمسوڵمانان کە چاك لە دینەکەیان حاڵی نەبوونو لەبەرانبەر دوژمنانیشدا هەست بە لاوازی دەکەن، دەکەونە ژێر (تأثیر)ی ئەو پروپاگەندانەو بێ ئاگا لەوەی کە دیموکراسیەت یانی: حوکمی -شعب- گەل، ئایا دەبێ بەدوای حوکمی خوا بکەوێ، کە خوا دەفەرمووێ:﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ﴾ (یوسف:٤٠) ﴿ولايُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَداً﴾ (الکهف: ٢٦)..یان بەدوای حوکمی گەل !! خۆ هەر وەك چۆن هیچ کەس بۆی نیە لەعیبادەتدا شەریك بۆ خوا بڕیار


www.alibapir.net

بدات، بەهەمان شێوە نابێ لە (حکم) یشدا هیچ کەس بکاتە شەریکی خوا، وەك دەفەرمووێ: ﴿ ولايُشْرِكُ في حُكْمِهِ أَحَداً ﴾ کەواتە: کە دەڵێن ئێمە دژی دیموکراسیەت نین و پێی ڕازین و بادیموکراسی حاکم بێت ئەوە کوفرەو مسوڵمانی پێ لە بازنەی ئیسلام دەچێتە دەرێ.[٩]

ئەو خراپەکاریو زوڵم و زۆرە کە ئاراستەی عالەمی دەکەن، ئەو هەموو ستەمو دەستدرێژیەی کە پەرلەمانەکانی ڕۆژئاوا لە ژێر سایەی دیموکراسیدا قەراری لەسەر دەدەن، ئەمریکاو وڵاتانی تر کەدێن وڵاتانی ئیسلامی دادەپڵۆسن و ئیستعمارو ئیمپریالیزمی کۆن و نوێ کەجیهانی ئیسلامی دەشێوێنن و مسوڵمانان زەلیل دەکەن، هەموو ئەو بڕیارانە لە پەرمانەکانی خۆیانداولە ژێرسایەی دیموکراسیەتدا دەدرێن!

ئەی برای مسوڵمان! پێویستە تۆ بزانی دیموکراسیەت مانای چی یە؟ نابێ بەعەقڵی خۆت مەفهومێکی بۆ بتاشی، بەڵکو دەبێ سەیر بکەی بزانی لەنێو ئەهلی دیموکراسیەتدا دیموکراسیەت یانی چی؟ هەر وەکو جیهادیش پێویستە مسوڵمان مانای لێکبداتەوە نەك ئەهلی کوفر بەبۆچوونی خۆی مانای لێك بداتەوەو پێناسەو تەفسیری بکات.

نابێ تۆ بۆ خۆت مانای دیموکراسیەت لێك بدێتەوە، کە دەڵێیت: دیموکراسیەت یەعنی ئازادی بیروڕاو مافی مرۆڤ و سەر بەرستی تاك و.. ئەمە هەڵەیە.. چونکە جەوهەری دیموکراسیەت لای ئەهلی خۆی و لای ئەمریکایی و ڕۆژئاوایی یەکان یانی: حوکمی گەل بۆ گەل، وە لەژێر سایەی ڕژێمێکی دیموکراسیدا پەرلەمان (کونگرێس)کە –

---

(٩) دیارە بۆ جی بەجێ کردنی (تطبیق)ی ئەم حوکمە لەسەر هەرکەسێك دەبێ سەرنج بدرێ داخوا مەرجەکانی کافر بوون هاتوونەتەدیو پەرچەکانی لاچوون یان نا!!. کە زانایان زاراوەی : (ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) یان بۆ داناوە، کەواتە مەرج نیە هەر کەسێك شتێکی گوت یان کرد کە بەکوفر لەقەڵەم دەدرا یەکسەر حوکمی کافر بوونی بەسەردا بدرێ، بەڵکو وەك گوتمان دەبێ سەرنجی حاڵو باڵی بدرێو تحیقیق لە وەزعی بکرێ ئەوجار...



www.alibapir.net

نێوێنەری گەل (شعب)ە لەجیاتی خواو پێغەمبەرەکەی‌و ئایینەکەیان بڕیار دەدات‌و چاك‌و خراپ‌و حەڵاڵ‌و حەرام دیاری دەکات بەبێ هیچ حیساب کردنێك بۆ خواو پێغەمبەرەکەی‌و ئایین و بەرنامەکەی!!

دیموکراسیەت یانی بەخوا گرتنی گەل (تَأْلِيهُ الشَّعْب) لە شێوەی مەجلیس‌و پەرلەمانێکدا کە قەرارو بڕیار دەدات‌و حەڵاڵ حەرام دەکات‌و حەرام حەڵاڵ دەکات! مەبەستمان لەم قسانەمان ئەوەیە کە هەق چۆنە ئاوا ڕوون ببێتەوە ئەگەر نا نامانەوێ تانەو تەشەر لەکەس بدەین، بەڵام بەڕەواشی نازانم هەق بەقوربانی دڵڕاگرتنی هیچ کەس بکەم، تێکڕای مسوڵمانانم خۆش دەوێ لەبەر خاتری خوا، بەڵام هەر لەبەر خواش ئیسلاممان لە مسوڵمانان خۆشتر دەوێ.

## ئامانجەکانی جیهاد بە کورتی

١-بەر پەرچ دانەوەی دەست درێژی دەست درێژی کاران ﴿ فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ﴾ (البقرة: ١٩٤).

٢-یارمەتی دان‌و پشتیوانیی کردن لەداماوو زۆر لێکراوان ﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ ﴾ (النساء: ٧٥).

٣-بەرز کردنەوەو گەیاندنی پەیامی خوای بێ هاوەڵ بەهەموو بستە خاکێکی سەر زەوی‌و بەهەموو ئینسانێکی سەر زەوی، کە ئەمە دوایین قۆناغ وبەرزترین ئامانجی جیهادە ﴿ وقاتلوهم حتى لاتكون فتنة ويكون الدين * كله لله ﴾ (الأنفال: ٣٩).

---

* مەبەست لە وشەی (دین) لێرەدا گەردن کەچی‌یەبۆ دەستەڵاتی ئیسلامی، نەك (ئیسلام) یان مسوڵمان بوون، چونکە وەك پێشتر گوتمان ئیسلام بۆ ئەوە ناجەنگێ کە خەڵك بەتۆبزی و زۆر ملێ مسوڵمان بن، بەڵکو بۆ ئەوەی دەجەنگێ کە خەڵك فشارو کاریگەری دەستەڵاتی کوفرو شیرکیان لەسەر نەمێنێ کە ڕێگایان نەدات بەویستی ئازادانەی خۆیان مسوڵمان ببن، پێشتریش ڕوونمان کردەوە کەمسوڵمانێتی‌بەزۆرەملێ نایەتەدی‌و شتێکی ناواقیعی‌یە وێڕای ناشەرعی بوونی!

www.alibapir.net

## حەوتەم: جیهاد لەواقیعی ئەمڕۆماندا

وەكو لەسەرتاوە باسم كرد هەندێك كەس پێیان وایە ئێمە بزووتنەوەی ئیسلامی چەكمان بۆ ئەوە هەڵگرتووە هەركەسێك پێچەوانەی بیرو بۆ چوونی ئێمە بیر بكاتەوە ئێمە لێی قبوڵ ناكەین و پەت و سێدارەمان بۆ ئامادە كردووە!! كەلەوانەیە هەڵس و كەوتی نەشیاوانەی هەندێك برایانی پێشمەرگە كەتەواو حاڵی نەبوون و جاری كرچ و كاڵ و (تصریحات)ی هێندێك كەس زەمینەی ساز كردبێ و بیانووی بەدەستی ئەو جۆرە كەسانەوە دابێ، بەڵام حەقیقەتی بزووتنەوەی ئیسلامی وانی یەو بەوشێوەیە نی یە.

ئێمە لە كوردستانداو كۆمەڵە ئیسلامی یەكانی تریش لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامی دا بۆ ئەوە كار دەكەین كە كۆمەڵگاو میللەتی خۆمان بگێڕینەوە بۆ ئیسلام، بانگی ئەو خەڵكانە دەكەین و دەرسیان پێ دەڵێین، قورئانیان تێ دەگەیەنین بە رچاویان ڕوون دەكەینەوە، فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەحكامی شەرع یان تێ دەگەیەنین هەموو ئەمانە بۆ ئەوەیە كە ئەوەی مسوڵمانە مسوڵمانتر بێت و ئەوەی كەلای داوە بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام و مسوڵمان ببێت، وە چەك هەڵگرتنی ئێمە بۆ دوو شتە:

أ) بۆ ئەوەی هیچ كەس نەتوانێ ڕێگەمان پێ بگرێ كە كۆمەڵگاو میللەتی خۆمان لەدین و عەقیدەكەی حاڵی بكەینەوەو تێی بگەیەنین.

ب) دەنگ وقسەی ئێمە بەعیزەتمەندانەو دلێرانەو حساب بۆ كراوبێ و، زەلیلانەو داماوانەو بەخاتری و خوایشی خەڵك و لە ژێر دەستەلاتی خەڵك و بەپارانەوە لەوان نەبێت.



www.alibapir.net

کەواتە چەکی ئێمە بۆ ئەوە نیە ئەو خەڵکە هەمووی ببێتە بزوتنەوە یان مسوڵمان بێ، ئەگەرنا شەڕیان لەگەڵ بکەین‌و بیانکوژین، نە ء چونکە نەخوای پەروەردگار نە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) ئەمەیان نەفەرموە، بەڵکو خوای باڵادەست دەفەرمووێ: ﴿ فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر ﴾ (الكهف: ٢٩).. پێغەمبەریش (ﷺ) لەو فەرموودەی پێشتر کەباسمان کرد فەرموویەتی: ئەگەر گەیشتیە دوژمنان بانگیان بکە بۆ سێ شتان هەر کامێکیان وەرگرت لێیان قبوڵ بکەو دەستیان لێ بپارێزە...

## ئایا بوونی ( خەلیفە ) مەرجە بۆ فەرزبوونی جیهاد ؟!

لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئەم مەسەلەیە ڕوون بکەمەوە چونکە هەندێك کەس پێیان وایە -کە خۆشیان بە مسوڵمان‌و ئیسلامی دەزانن- هەتا مسوڵمانان پێشەواو خەلیفەیەکیان نەبێت کە هەموو ئۆممەت (سمع و طاعة)ی بۆ بکات، جیهاد فەرزنابێ و ناکرێ، کەبەڕاستی ئەمە بیرکردنەوەیەکی سەرکێڵانەیە، چونکە:

١-زانایانی ئیسلام یەك دەنگن لەسەر ئەوەی هەر کاتێك خەلیفەی مسوڵمانان کافر بوو،بەپێی ئەو حەدیسەی پێغەمبەری (ﷺ) کە دەفەرمووێ: ((إِلَّا أَنْ تَرَوا كُفْراً بَوَاحاً)) کاتێك کە کوفرێکی ئاشکرا لە خەلیفەی مسوڵمانان بینرا، لەسەر مسوڵمانان فەرزە ئەو خەلیفەیە لابەرن، ئەگەر خەلیفە لانەچوو پێویستە شەڕی لەگەڵ بکەن، کەواتە لەو کاتەدا خەلیفەشیان نیەو جیهادیشیان بۆ لابردنی ئەو بەناو خەلیفە کافرە لەسەر واجبە!!



www.alibapir.net

٢-چەندان حەدیسی پێغەمبەر (ﷺ) هەن هەندێك لە زانایان دەڵێن: گەیشتوونەتە ئەندازەی (تواتر)،موژدە دەدەن بە ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) کەهەتا دونیا ماوە کۆمەڵێك لە ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) کەبە -(الطائفة المنصورة) کۆمەڵی یارمەتیدراو و وکۆمەڵی سەرخراو مەشهوورە- دەمێنێتەوەو بەجەنگ و جیهادەوە دەژین، کەدەفەرمووێ: (لَنْ يَبْرَحَ هذا الدِّينُ قائِماً يُقاتِلُ عَلَيْهِ عِصابَةٌ مِنَ المُسلمين حَتَّى تَقُومَ الساعةُ) (رواه مسلم).. یەعنی: ئەم دینە دەمێنێتەوەو کۆمەڵێکی ڕێك و پێك و دامەزراو لەپێناوی‌دا دەجەنگن تا ڕۆژی دوایی، کەواتە ئەم دینە تا ڕۆژی دوایی دەمێنێتەوە بەهۆی جەنگ و وجیهادەوە کە کۆمەڵێك بەفیداکاری‌یەوە ئەنجامی دەدەن، لە پێناوی خوادا.

لەحەدیسێکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (لاتَزالُ طائِفَةٌ من أُمَّتي يُقاتِلونَ علىٰ الحَقِّ ظاهِرِينَ إلىٰ يَوْمِ القِيامَةِ) (رواه مسلم).. یەعنی: بەردەوام تا ڕۆژی دوایی کۆمەڵێك لە ئوممەتی من جەنگ دەکەن لەسەر (حق) کە ئیسلامە.

وەدەفەرمووێ: (لاتَزالُ طائِفَةٌ مِنْ أُمَّتي قائِمَةٌ بِأَمْرِ اللهِ لايَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ أَوْ خالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ) (رواه مسلم).. یەعنی: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتی من لەسەر حەق دەمێننەوە لە پێناوی‌دا دەجەنگن بەدەسەڵاتەوە، ئەئەوانەی مسوڵمانن و پشتیان بەردەدەن و پەرچیان دێننە ڕێ و ناوو ناتۆرەیان دەخەنە پاڵ زەرەیان پێ دەگەیەنن، (أو خالفهم) ئەئەوانەش کە دژیان دەوستن کە (ئەهلی کوفر)ن، کەواتە بەم دوو بەڵگەیە کە باسمان کرد سەلمێنران کەهەبوونی خەلیفەیەك کەسەرجەم یان بەشێك لەمسوڵمانان لەژێر ڕکێفی خۆی‌دا کۆبکاتەوە، مەرج نیە بۆ فەرزبوونی جەنگ و جیهادو دروست (جائز) بوونی ئەنجام درانی، وەلە ڕاستی‌دا زۆر لەوانەی بۆ دانیشتن و هەڵخزان و نەجوولان و



www.alibapir.net

ئیسراحەت لەخۆتێك نەدان و دووچار نەبوونی ئەزیەت و نارەحەتی یەکانی کۆچ (هجرة)و جەنگ و جیهاد دەگەڕێن ئەو جۆرە قسانە دەکەن، ئەگەر نا زاناو پێشەوایانمان زۆر بەڕوونی باسی ئەو حاڵەتەیان کردوە کە مسوڵمانان خەلیفەو فەرمانڕەوایان نامێنێ و هەموشیان یان زۆربەی هەرە زۆریان -لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە لەو حاڵەتەدا جیهاد ڕاناوەستێ (الجِهادُ ماضٍ إلىٰ يَوْمِ القيامَةِ)و مشوور خواردن و سەرپەشتی کردنی کاروباری مسوڵمانانیش لەبواری جەنگ و جیهادو هەر بوارێکی دیکەشدا دەگەڕێتەوە بۆ دەستی کاربەدەستان (أولي الأمر) ی مسوڵمانان کە شەرع زانان بە (أهل الحل والعقد) یان ناو بردوون [10]، چونکە لەئەسڵدا ویلایەت ودەسەڵاتی شەرعی کاروباری مسوڵمانان لە دەستی کاربەدەستانیان دایەو هەر ئەمانیش خەلیفەو فەرمانڕەوا دیاری دەکەن و هەڵی دەبژێرن خوای دادگەرو فەرمانڕەوا فەرموویەتی:

﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الأَمْرِ مِنْكُمْ ﴾ (النساء: ٥٩).

(أولي الأمر) یش وەك زانایان فەرموویانە ئەوانەن کەلە نێو مسوڵماناندا خاوەن زانیاری و دەسەڵاتن (أولي العلم والقدرة) کەواتە زانایان و خاوەن پایە ودەسەڵاتی نێو ئوممەت (أولي الأمر)و (اهل الحل والعقد) پێك دێنن.

کەواتە کورتەی قسان ئەوەیە کە جیهاد لە ئیسلامدا یەکێکە لە فەرزە گەورەکان و یەکێکە لە ڕوکن وپایەو بنچینەکانی ئیسلام، کە پێغەمبەریش ((ﷺ)) لەنێو پێنج ڕوکنەکاندا کە (شایەتمان ونوێژو ڕۆژوو حەج و زەکات)ن باسی نەکردوە لەبەر ئەوەیە کە ئەوپێنج پایەو

---

(١٠) لە زۆربەی کتێبە شەرعی یەکان ئەم مەسەلەیە ناماژەی پێ کراوە بەتایبەتی (جوینی) لە کتێبی (غیاث الأمم..) دا جوانی ڕوون کردۆتەوە.



www.alibapir.net

ڕوکنانە لەسەر هەموو مسوڵمانێك وەك (فــــرض العـــين) پێویستن، بەڵام جیهاد لەسەر تێکڕای مسوڵمانانە، چونکە ئەو جیهادەی باسمان کرد بەکۆمەڵ دەکرێتو وانەبێ ئەنجام ناردێ.

وە (إبن تيمية) وزۆری زانای تر فەرموویانە: ئەوندەی قورئان وسووننەت مەدحی جیهادو موجاهیدانو باسی پاداشتی بەرزیان دەکەن، مەدحی هیچ جۆرە عیبادتێکی تر بەو ئەندازەیە نەکراوە .

لەخوای بەرزو مەزن داواکارین ئێمەی مسوڵمان لەکورستانو غەیری کوردستانیش دا لە ڕیزی موجاهیداندا بین، ئەگەر ئەو تۆفیقەش نەبوو لای کەم پشتیوانی موجاهیدان بین، بەدەست و زمان و دڵو ماڵمان لەگەڵدابینو دوعایان بۆ بکەین.. خوایە ئەوانەی لەسەر تاسەری زەویدا دیفاع لە دینی تۆو ئیسلامو موقەدەساتی دینی تۆ دەکەن تەوفیقیان بدەیتو سەریان بخەیت بەسەر دوژمناندا و ڕێگایان بۆ تەختو ئاسان بکەیو دوژمنو ناحەزانیان زەلیلو ڕیسوا بکەی.

خوایە لە سایەی خەباتو جیهادو فیداکاری لە پێناو دینی تۆدا ئێمەی مسوڵمانی کوردو باقی مسوڵمانانی دنیا عەزیزو سەر بڵند بکەیو ڕوو سووری دنیاو قیامەتمان بکەین ... آمــــین..

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net



www.alibapir.net

# بەشی دووەم: چەند ئاگاداری یەك دەربارەی جەنگ‌و جیهاد

بەپێویستی دەزانم ئەم چەند تێبینی‌و ئاگاداری‌یە گرنگە ئاڕاستەی هەموو برایانی موجاهید بکەم، بە قیادەوە قاعیدەوە چونکە بەداخەوە کرچ‌ووکاڵی‌و هەڵەو هەڵەشەیی زۆر بەدی دەکەم، بەهیوای ئەوەی کە هەرکام لەم ئاگادارییانە تیشکێکی بەرچاو ڕۆشن کەرەوەو نقورچکێکی بێدار کەرەوە بێت بۆ هەموو لایەکمان بەگشتی‌و، بەتایبەت بۆ ئەوانەی گیرۆدەی داوی ئەو هەڵەو پەلانە بوون‌و، بێ ئاگایانە وناحاڵی‌یانەش خۆیان لەسەر جادەی هەق وڕێبازی شەرعیش دەبینن!.

## ١-جەنگ وجیهاد ئەرکێك نیە بەهەمووکەس ئەنجام بدرێ:

بەدرێژی مێژووی دینداری‌و مسوڵمانەتی لەسەر زەوی، هەمیشە ئەوانەی کە ئامادەیی جێبەجێ کردنی ئەرکی جیهادو بەرەنگاری‌یان هەبووە لەنێو ئیمانداران دا کەمینە (أقلية) بوون، ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوۡاْ إِلَّا قَلِيلاً مِّنۡهُمۡ..﴾ (البقرة:٢٤٦) دیارە هۆی ئەمەش ئاشکرایە، کە بریتیە لەقورسی ومەترسی دار بوونی جەنگ‌و جیهادو، پەك کەوتنی جیهاد لەسەر خەملان‌و وپێگەیشتنی کۆمەڵێکی هەڵبژاردە کە گەلێك خەسڵەتی بەرزو پەسەند -کە بۆ جیهادو بەرەنگاری پێویستن- ڕازابنەوە، بەڵی کەسانێك بیانەوێ خاك‌و خەڵکی خوا لەدەستەڵاتی کوفرو شیرك‌و خراپەو ستەم‌و فەسادێك کەلەسایەی‌دا پەیدا بووە بژاروپاك بکەنەوە، حەتمەن دەبێ پێشتر خۆیان لەخراپەو ناشەرعی



www.alibapir.net

وهەڵە پەڵەکان بژارو پاك کردبێتەوە، ئەگەر نا کەسێك خۆی شتێك شك نەبات چۆن دەتوانێ لێی ببەخشێ !!

جا ئێمە لێرەدا تەنها دووئایەتی قورئانی بەرێز بەبەڵگەو نموونە دێنینەوە:

خوای دادگەرو بالادەست فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللهَ اشْتَرَىٰ مِنَ المؤمنين أَنفُسَهُمْ وَأَموالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقاتِلونَ فِي سَبِيلِ اللهِ فَيَقْتُلونَ وَيُقْتَلونَ وعداً عَلَيْهِ حقاً فِي التوراة والأنجيل والقرآن، وَمَنْ أَوفىٰ بِعَهْدِهِ مِنَ اللهِ فَاسْتَبْشِروا بِبَيْعِكُمُ الَّذي بايَعْتُمْ بِهِ وَذٰلِكَ هُوَ الفَوْزُ العَظِيمُ ، التائِبونَ العابِدونَ الحامِدونَ، السّائِحونَ الرّاكِعونَ السّاجِدونَ، الآمِرونَ بِالمَعْروفِ وَالنّاهُونَ عَنِ المُنكَرِ وَالحافِظونَ لِحُدودِ اللهِ وَبَشِّرِ المُؤْمِنِين﴾ (التوبه: ١١١-١١٢).

واتە: بێگومان خوا گیان و سامانی لەبڕواداران کڕیوە کە بەهەشتیان بداتێ، لەرێی خوادا دەجەنگن دەکوژن و دەشکوژرێن، -ئەوە- بەڵێنی خوایە و ڕاستە لەتەورات و ئینجیل و قورئان دا، وەکێ لەخوا بە پەیمانی خۆی وەفادارترە! دەجا دڵخۆش بن بەوسەوداو مامەڵەیەی کە کردووتانە، وەهەر ئەوەشە سەرفرازی مەزن، -بۆ ئەوانەی کە- تۆبەکاران و خواپەرستان و ستایشکەران، ڕۆژوو گران و ڕکووع بەران کڕنووش بەران، فەرمانکەران بەچاکەو ڕێگران لەخراپەو پارێزەرانی سنوورەکانی خوا- ی پەرەوەردگار-ن وە موژە بدە بە بڕواداران. (واتە: موژدەی سەرکەوتنی دنیاو سەفرازی دوا ڕۆژ بەوجۆرە بڕوادارانە بدە).

بەڵێ برا بەرێزو خۆشەویستەکانم جەنگ و وجیهاد لەرێی خوادا وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: چڵەپۆپەو لووتکەی هەرەبەرزی ئیسلامەتییە: ((.. رَأْسَ الأَمْرِ الإِسْلامُ وعَمودُهُ الصَّلاةُ وذِرْوَةُ سَنامِهِ الجِهادَ فِي سَبِيلِ اللهِ..)) (رواه الترمذي بإسناد صحيح).

www.alibapir.net

دەجا ئاشكرايە كەئینسان ناتوانێ چنگ بگەیەنێتە لووتەكەی چیایەك
هەتا بەپێ‌دەشت و وبنارو قەدپاڵەكەی هەڵنەگەڕێ، كەواتە باوا نەزانین
كە هەركەس ڕاست بۆوەو چەكێكی بەدەستەوەگرت و ڕیشێكی
هێشتەوە بەدوو ڕۆژ دەبێتە موجاهیدێكی تێرو تەواوو تەواو عەیار،
چونكە (كەس لەپڕ نەبووە بەكوڕ) و كەسێك زانیاری وتێگەیشتنێكی
تەواووئیمان و عەقیدەیەكی دامەزراوو عیبادەتێكی بێ خلتەو دوور
لەبیدعەت و خوو ڕەوشتێكی بەرزو جوان و ڕەفتارو هەڵس وكەوتێكی
بەپێی شەریعەتی نەبێ، ناڵێم بەكەڵكی هیچ نایەت چونكە ئیسلام
كەسی لێ زیاد نیە، بەڵام لەوەش كەمترە كەناوی (موجاهید) ی لێ بنرێ!

چونكە وەك بینیومانەو دەبینین بابایەوا لەسۆنگەی ناتێگەیشتوویی
لەئیسلام و لاوازیو دانەمەزراوی ئیمان و عەقیدەكەی ونەبوونی
عیبادەتێكی ساغ و پاك و ڕەوشتێكی بەرزو چاك و هەڵس و كەوت و
مامەڵەیەكی حەكیمانەی شەرعی یانەوە، قسەو وتارو هەڵوێست و
ڕەفتاری هێننە غەڵەت وپەڵەت و سەیرو سەمەرەی لێ دەپشكوێتەوە كە
جیهادو موجاهیدانیش -نەك هەرخۆی- دەباتە ژێر پرسیارەوەو
ئیسلام ومسوڵمانان لەسەری قەرزدار دەبنەوە!

بەڵێ خۆشەویستەكانم: بەڕاست بەس ئەوانە دەتوانن سەوداو
بازرگانی گیان و سامان بەخوا فرۆشتن و بەهەشت كڕین لەگەڵ خوای
پەروەدگاردا بكەن و بەڵێن وپەیمانیشیان ڕاست بەرنەسەر،كە
خواپەرستیی ڕەسەن و مسوڵمانەتی ڕاستەقینەیان تێدابێ و بەو
خەسڵەت و سیفەتە ڕەندو پەسندانە خۆیان ڕازاندبێتەوە كە مەرجی
دینداری ومسوڵمانەتین، هەر بۆیەش خوای زاناو پەروەدگار لەدوای

www.alibapir.net

ئایەتی پەیمان و بەڵێن لەگەڵ خوا بەستن لەسەر جیهادو فیداکاری: ﴿إن الله أشترى ﴾ یەکسەر فەرموویەتی: ﴿ التائبون العابدون الحامدون ﴾ وە نۆ (٩) سیفەتی گەورەو بنچینەیی ڕیزکردوون، وەپاش ئەو نۆ (٩) خەسڵەتە بەرزە یەکسەر فەرموویەتی: ﴿ وبشر المؤمنين ﴾، تاکو بزانین کە بڕوادارانێك شایستەی مـوژدەو مزگێنـی خـوان بەسـەر کـەوتن وسەرفرازی دنیاو دوا ڕۆژو، مسوڵمانانێك لە جەنگو وجیهادەکەیان دا براوە دەبن کە خاوەن ئەو خەسڵەتانە بن نەك هەموو مسوڵمانێكو هەر خۆ بە موجاهید زانێك!

## ٢- جیهاد عیبادەتێکە بۆ خوا دەکرێو نابێ منەت لەسەر خەڵك بکرێ

بەڵێ بەپێی ڕای زۆر بەیان تێکڕای زاناو پێشەوایان جەنگ وجیهاد لەڕێی خـوادا گـەورەترین جـۆرە خواپەرستی‌یە کە بەکۆمەڵ ئـەنجام دەدرێو، ئەوەندەی ئایەتی قورئانو فەرمایشتی پێغەمبەرمان (ﷺ) مـەدحی جیهادو موجاهیدان و باسـی پاداشـتی مـەزنو پلەوپایـەی بەرزیان دەکەن، لەبارەی هیچ جۆرە خواپەرستی‌یەکی دیکەوە هێنـدە نەدواون، کەپێم وایە ئەم دەقە قورئانی‌یە لەهەموو دەقەکانی دیکە چاکتر ئەو مەبەستە دەگەیەنێ: ﴿... وَفَضَّلَ اللهُ المُجَاهِدِينَ عَلَى القَاعِدِينَ أجراً عظيماً، دَرَجاتٍ مِنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً وكَـانَ اللهُ غَفُـوراً رَحِيمـاً ﴾ (النساء: ٩٥-٩٦).

جا مادام جیهاد لەڕێی خوادا کردنیش خواپەرستی‌یەك بێت وەك باقی خواپەرستی‌یەکانی تر، بۆ وێنە:نوێژو ڕۆژوو حەج و دوعاو زیکر

www.alibapir.net

... هەروەك چۆن نابێ هیچ كەس بەهۆی نوێژكردنو ڕۆژوو گرتنو دوعاو پاڕانەوە وە منەت وفیزو كەشخەیی بەسەر كەس دا بكات! بەهەمان شێوەش بەهۆی جێبەجێ كردنی ئەركی جیهادیشەوە منەتباركردنی خەڵكو پۆزلێدان و فیزوناز بەسەردا كردنیان شتێكی ناشەرعیو ناماقووڵو بێجێیە. هەر چەندە بەداخەوە ئەم حاڵەتە هەڵەو نەخۆشییە دەروونییەش كەمو زۆر هەستی پێ دەكرێو، ئیواهەیە كە بەحیساب موجاهیدیشە كەس ناوێرێ پێی بڵێ پێت خوار داناوە، دەیكاتە هەراو گاڵەو هەندێك جاریش شەڕو فەرتەنە دروست كردنیش ! فەقیرە وادەزانێ بێگار بۆ خەڵكی دەكاتو سۆخرەیان بۆ كێشێ، لەجیاتی ئەوەی هەست بكات كەلە میحرابی خواپەرستیو بەدەست هێنانی بەهەشت و ڕەزامەندی خودایەو، ئەگەر بەڕاستی بێ موجاهیدبێ دەبێ هەمیشە سوجدەی شوكرانە وسوپاس بۆ خوا بەرێو یەك دنیا مەمنوونی بێت كە هیدایەتی داوە یەكێك لەئەركە هەرە گەورەو گرنگەكانی ئیسلام جێبەجێ بكات، خوای پەروەردگارو پەنهان بینیش سەبارەت بە كەسانێك كە بەهۆی مسوڵمان بوونیانەوە منەتیان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) ومسوڵمانان دەكرد بەتوندی بەرپەرچی داوەتەوە فەرموویەتی: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُلْ لَا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُمْ بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴾ (الحجرات: ١٧).

جا خوایە بەلوتف كەرەمی خۆت بمانپارێزی لەوەی كە بەهۆی ئەنجام دانی ئەركێكی بەندایەتی بۆتۆ -كەبێگومان سوودو كەڵكەكەشی هەر بۆ خۆمانە- منەت لەسەر خەڵكی بكەین، ئای چەند سەیرو سەمەرەیە (كار) بۆ خوا بكەی، كەچی بۆكرێ و پاداشتەكەی چاوەڕێی خەڵكی بی !!

www.alibapir.net

# ٣-جیهاد بەبێ خۆڕاگری لەبەردەم هەژاریداو چێژتنی تاڵاوی نەداری ناکرێ:

بەڵێ بێگومان جەنگ وجیهاد کە ئەو پەڕی فیداکاریو خۆبەخت کردنو بەخشینی گیانو سامانی تێدایە *(والبَذْلُ بِالنَّفْسِ مِنْ أعْظَمِ الجُودِ)*، بەبێ پشوو درێژیو خۆڕاگری لەبەردەم ڕەشەبای نەداریو گێژە لووکەی ئەو ناخۆشیو نەخۆشی‌یانەی کەلێیەوە پەیدا دەبن بۆ ئینسانی مسوڵمان مەیسەر نابێ، هەر بۆیەش خوای پەروەدگار فەرموویەتی: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُمْ مَثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلِكُمْ مَسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللَّهِ؟! أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ ﴾ (البقرة: ٢١٤)

واتە: یان ئایا پێتان وایە دەچنە بەهەشتێ بەر لەوەی ئەو حاڵەتان تووش بێ کە تووشی ئەوانە بوو کە لەپێش ئێوەدا ڕابردوون! کەنەداریو نەخۆشی پێیانەوە چەسپ بوو، وەڕاشەقێنران هەتا پێغەمبەرە کەیان وە ئەوانەی بڕوادار بوون لەگەڵیدا گوتیان: یارمەتی خوا کەی دێ !! ئاگادار بن یارمەتی خوا نزیکە.

بەڵێ چارمان نیە دەبێ لەسەر نەداریو قەرزداریو ئازارو مەینەتی‌یەکانیان خۆڕاگر بینو، هەژاریو سەختی ژیانو گوزەران نەچۆکمان پێ دابدەنو پاشەکشەمان پێ بکەن، وە نەواشمان لێ بکەن خۆمان تووشی گوناهباریو عەیبداری بکەینو دەست بەکون وکەلێنی ناشەرعی وا بکەین وشتی‌وا بکەین خۆمان ڕوو زەردو ئیسلام و جیهادیش دزێوو ناشیرین بکەین.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە کە بۆ بابای مسوڵمان و موجاهید نارەوا بێت بە گوێرەی تواناو بڕستیو لە سنووری شەرعو ئادابەکانیدا



www.alibapir.net

هەوڵی پەیدا کردنی بژێوو ڕۆزی حەڵاڵ بداترلە ژێر باری نەداری بێتەدەر، چونکە کاسبی کردنو ڕۆزی حەڵاڵ و پاك پەیدا کردن پیشەوعادەتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و پێشەواو پیاوچاکان بووە، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە ئەگەر لەقۆناغێك لەقۆناغە سەخت و دژوارەکانی جیهاددا بابای موجاهید هەرچی کرد نەیتوانی لەبن باری نەداری قوتار بێت، با وریا بێت ئەو نەداریو نارەحەتیو سەغڵەتی‌یە نەساردی بکاتەوە لەجیهادو کۆڵی پێ بدات، وەنە دووچاری گوناهباریو عەیبداریشی بکات.

ئەگەرنا نەداری (فقر) یەکێکە لەو بەڵاو نارەحەتی یانەی‌کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەپاڕانەوەکانی‌دا پەنای لێ بەخوا گرتووەو لەگەڵ کوفردا ڕیزی کردوەو فەرموویەتی: (اللهُمَّ إِنِّي أَعوذُبِكَ مِنَ الكُفْرِ وَالفَقْرِ..) دیسان قەرزداریش هێندە بارێکی قورس و دەردێکی گرانە پێغەمبەرمان (ﷺ) لەچەندان فەرمایشتی‌دا لەخوا پاراوەتەوە کە لێی بەدوور بکات (وأعوذُبِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدَّين وَقَهْرِ الرِّجالِ)(رواه مسلم)، وە بەپێچەوانەی حاڵی بوونی خوارو خێچی زۆر لەمسوڵمانان دەوڵەمەندی وبێ نیازی نەك هەرشتێکی خراپ نیە، بگرە شتێکی پێویستو خوازراویشە هەم لەقورئانو هەم لەسوننەتی پێغەمبەریشدا، بۆ وێنە خوای میهرەبان فەرموویەتی: ﴿ رَبَّنا آتِنا فِي الدُّنْيا حَسَنَةً وفِي الآخرةِ حَسَنَةً..﴾ (البقرة: ٢٠١) دیارە وشەی (حسنة ) ش هەموو چاکیو خێروخۆشیەکی ماددی ومەعنەوی دەگرێتەوە، پێغەمبەریشمان (ﷺ)فەرموویەتی(اللهم إني اسألك الهدى والتقى والعفاف والغنى)(رواه مسلم) واتە: ئەی خوایە من داوای هیدایەت و پارێزکاریو پاکی و بێ نیازیت لێ دەکەم. (دیارە بێ نیازیش هەردوولایەنی مەعنەوی ماددی دەگرێتەوە).

www.alibapir.net

## ٤- دەستووری هەڵس و کەوت لە حاڵەتی جەنگ و غەیری حاڵەتی جەنگ دا جیاوازە:

پێشینان گوتوویانەک (کەنگرو ماست بەوەختی خۆی) هەروەها گوتراوە: (لِكُلِّ مَقامٍ مَقالٌ ولِكُلِّ مَيْدانٍ رِجالٌ)، زانایان لەپێناسەی حیکمەت (الحكمة)دا فەرموویانە: *(هو التصرّف حَسَبَ مُقْتَضى الحالِ)* هەڵس و کەوت کردنە بەپێی داخوازی حاڵ و مەقام.

جا لەسۆنگەی ئەوەوە کە حاڵەتی جەنگ و ڕوو بەڕوو بوونەوە حاڵەتێکی نائاسایی یەو گرژیی و توندو تیژیی و کوشتارو کارەساتی جەرگبڕی تێدان شەریعەتی پڕ حیکمەتی خوای کار بەجێ ڕێی بەموجاهیدان داوەو بگرە لەسەریشی فەرز کردوون، کە لەکاتی جەنگ و وجیهادو بەرەنگاری دا توندوتیژیی و ڕەقیی و زبریی و بێ ڕەحمی بەرانبەر دوژمن بنوێنن، چونکە بێگومان ئەمانە موفرەدە شیاوو پڕ بەپێسنەکانی حاڵەتی جەنگ و بەرەنگاریین و دوژمنێک کە بەخوێنی سەرت تینوویە بەم جۆرە زمانە نەبێ لێت حاڵی نابێ و بۆت تێ ناگەیەنرێ، خوای دادگەرو تۆڵەستێن لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِيْنَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِيْنِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللهُ بِقَومٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِيْنَ أَعِزَّةٍ عَلَى الكافِرِيْنَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيْلِ اللهِ وَلا يَخافُونَ لَوْمَةَ لائِمٍ ﴾ (المائدة :٥٤)

هەروەها فەرموویەتی ﴿ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ وَالَّذِيْنَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ .. ﴾ (الفتح :٢٩)

یان فەرموویەتی ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِيْنَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِيْنَ يَلُونَكُمْ مِنَ الكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا فِيْكُمْ غِلْظَةً واعْلَمُوا أَنَّ اللهَ مَعَ الْمُتَّقِيْنَ ﴾ (التوبة :١٢٣)



www.alibapir.net

سەرنج بدە چۆن لەدوای ڕستەی : ( با زبریتان پێوە ببینن - ولیجدوا فیکم غلظة ) یەکسەر فەرموویەتی : ( وەبزانن کەخوا لەگەڵ پارێزکاران دایە – واعلموا أن الله مع المتقين ..) تاکو بزانن کە بەشێك لەپارێزکاری ئینسانی مسوڵمان ئەوەیە کەلەکاتی ڕوو بە ڕوو بوونەوە و جەنگ دا لەگەڵ دوژمن دا ڕەق و زبر و بێ ڕەحم بێت .

هەروەها خوای پەروەردگار و میهرەبان فەرموویەتی ﴿ یاأَیُّها النَّبِيُّ جاهِدِ ٱلكُفَّارَ وَٱلمُنافِقِینَ وَٱغلُظْ عَلَیهِمْ ..﴾ ( التحریم : ٩ )

ئەمانە هەمووی لەکاتی جەنگ و بەرەنگاریدا . بەڵام بێگومان دەستور و شێوازی هەڵس و کەوت و ڕەفتار لەگەڵ خەڵکیدا چ کافر بن چ مسوڵمان ئەوە شتێکی ترە ، چونکە زۆر ڕوونە کەبازاڕی جەنگ و کوشتار لە بازاڕی مامەڵە و بازرگانی و هەڵس و کەوتە کۆمەڵایەتی یە ئاسایی یەکان لەیەك جیان ، جا با لەو بارەشەوە سەرنجی ئەم چەند دەقە بدەین : خوای دادگەر و میهرەبان فەرموویەتی ﴿ ..وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْناً ..﴾ (البقرة : ٨٣)

هەروەها فەرموویەتی ﴿ ..وَأَحْسِنُوا إِنَّ ٱللهَ یُحِبُّ ٱلمُحْسِنِینَ ﴾(البقرة: ١٩٥)

دیارە هەرکام لە (چاکە گوتن) و (چاکە کردن) لەم دوو ئایەتەدا موتڵەقن و تایبەت نەکراوە بەکات و شوێن و کۆمەڵێکی دیاری کراوەوە، کەواتە ئینسانی مسوڵمان و کۆمەڵی مسوڵمان قاعیدە لەلایان چاکە گوتن و چاکە کردن لەگەڵ هەموو کەس دا، لەبوراى هەڵس و کەوت دا.

دیسان خوای بەخشندە فەرموویەتی: ﴿ ..لاینهاكُمُ اللهُ عَنِ الَّذِینَ لَمْ یُقاتِلوكُمْ فِي الدِّینِ وَلَمْ یُخرِجوكُمْ مِنْ دِیارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقسِطوا إِلَیهِمْ إِنَّ ٱللهَ یُحِبُّ المُقسِطِینَ ﴾ (الممتحنة: ٨ )

بەڵێ دەستوورو شێوازی ڕەفتارو هەڵس و کەوتی مسوڵمان لەگەڵ خەڵکیدا بەگشتی تەنانەت ئەوانە شیان کەبێ بڕوان -بەمەرجێك


www.alibapir.net

دژایەتی‌یان نەکەن- بریتیە لە چاکەکاری و دادگەری‌و چاکە گوتن‌و خۆشرەفتاری.

دیسان خوای بەرزو مەزن‌و بێ وێنە دەربارەی چۆنیەتی وتوێژ کردن وهەڵس‌و کەوتی مسوڵمانان لەگەڵ کەسانێك دا کە دژو نەیاری ئایین وبیروباوەڕیانن فەرموویەتی: ﴿ أُدعُ إِلىٰ سبيل ربّكَ بالحِكْمَـةِ وَالْمَوْعِظَـةِ الْحَسَنَةِ وَجادِلْهُمْ بالتي هيَ أَحسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هوَ أَعلم بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبيلِهِ وَهُـوَ أَعْلَمُ بالْمُهْتَدينَ، وإِن عاقَبْتُمُ فعاقِبوا بِمِثْلِ ماعوقِبتُم به وَلَئِنْ صَبَرتُمْ لَهُـو خَيْـرٌ لِلصابِرين، وَآصبِر وَماصَبْرُكَ إِلا بِاللهِ وَلا تَحْزَنْ عَلَيهِم وَلاتَكُ في ضيـقٍ مِمّـا يَمْكرونَ، إن اللهَ مَعَ الذين آتقوا والذين هُمْ مُحْسِنون ﴾ (النحل: ١٢٥ -١٢٨).

واتە: بەلێزانی‌و ئامۆژگاری باش وبانگەواز بۆلای ڕێبازی پەروەدگارت بکە وە بەچاکترین شێواز گفت وگۆیان لەگەڵ بکە، بێگومان پەروەدگارت زاناترە بەوەی لەڕێی وی ون بووەو، هەر ئەویش زاناترە بەڕێی ڕاست گرتووان. وە ئەگەر -لەبەرانبەر دەستدرێژی‌یەکی بەرانبەرتاندا- سزاتان دان وەك ئەوەی سزای ئێوەیان پی داوە سزایان بدەنەوە، وەئەگەر ئارامیش بگرن بەڕاستی- ئەوە تۆڵەنەکردنەوەتان- چاکترە بۆ خوارگران، وە ئارام بگرەو بەس بەهۆی خواوەش ئارام دەگری وە خەمیان لێ مەخۆو دڵتەنگ مەبە بەهۆی پیلانگێڕانیانەوە، بێگومان خوا لەگەڵ ئەوانەدایە کە پارێز دەکەن‌و ئەوانە کە چاکەکارن.

پێغەمبەرش (ﷺ) لەوبارەوە فەرموویەتی: ((إِنَّ اللهَ رَفيقٌ يُحِبُّ الرِّفقَ في الأَمْرِ كُلِّهِ وَيُعْطي عَلَىٰ الرِّفقِ مالا يُعطي عَلىٰ العُنْفِ وما لايُعْطي علىٰ سِواهُ..)) (رَواهُ مُسْلمُ والبخاريُّ) إلاّ لفظ (في الأمرِ كُلِّهِ).

کەواتە: لەو دوو کۆمەڵە دەقەوە کەهێناومانەوە زانرا کەئیسلام بۆ هەرکام لەجەنگ‌و بەرەنگاری‌و کاتی ئاشتی وئاسایی دەستوورو شێوازێکی سەربەخۆو تایبەتی داناوەو ئێمەش ئەگەر پابەندی ئیسلام



www.alibapir.net

و مل کەچی شەرعی خوا بین، نەك گوتی لەمستی ئارەزوو و گەردن کەچی طەبعی خۆمان ئەوە بێگومان لەهەر حالە تێك دا بەشێوەیەکی حەکیمانەو پڕ بەپێست ڕەفتار دەکەین و هەرشتە لەشوێنی شیاوی خۆیدا دادەنێین دووچاری هەلەشەیی و ڕەفتاری سەرکێلانە نابین، خوای زاناو پەنهان بینیش فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ.. ﴾ (الأسراء: ٩)

**لەکۆتاییدا دەلێم:**

ئەوانەی کەلەکاتی مامەلەو هەلس و کەوتی ئاسایی لەگەل خەلك دا بەشێوازی کاتی جەنگ و کوشتار دەجوولێنەوەو ڕەفتار دەکەن، سەرەڕای ناشەرعی بوونی ڕەفتارەکەیان و بەدبین کردنی خەلك و سەر لێشێواندنیان سەبارەت بەئیسلام، وەك کەسێکیش دێنە بەرچاو کە لەکاتی تازیەو سەرەخۆشیدا قاقاپێ دەکەنێ و لەدەمی شاییو زەماوەندیش دا پرمەی گریان دەدات ! دیارە دەبێتە جێگای گلەییو وگازندەو سەرزەنشتی خەلکی و بگرە شیاوی نوکتە لەسەر هێنانەوەو گالتەو گەمەشیان!

هەلبەتە بەپێچەوانەوەش: ئەگەر لەکاتی شەڕو جەنگ دا بەشێوازی کاتی ئاشتیو ئاسایی لەگەل دوژمن و ناحەزانیدا ڕەفتار بکات، دیسان دەبێتە جێگای پێ پێکەنین و گالتەجاڕو مەسخەرەی دۆست و دوژمن!

جا خوایە تۆ بەخشندەو بەخشەری، داناییو وەستاییو کارامەیی مان لەکاروبارمان دا پێ ببەخشە، کە هەروەك چۆن بەپێی، یاسای ((نُنْزِلُ النَّاسَ منازِلَهُمْ)) * لەگەل کۆمەلگادا دەجوولێینەوە، بەگوێرەی (حیکمەت) و هەرشتە لەشوێنی خۆیدا ڕۆنانیش لەگەل هەر حالەت و وگۆڕانکاری و ڕووداوێکیش دا رەفتار بکەین.

* ((أَنزِلُوا النَّاسَ منازِلَهُمْ)) رَواهُ ابوداود عَنْ عائِشَةَ (رضی الله عَنْها).



www.alibapir.net

## ٥- با بەهەڵە لەڕستەی ﴿ولا يخافون لومة لائم﴾ لە لۆمەی لۆمەکەران ناترس حاڵی نەبین!

خوای پەروەردگار کەباسی ئەو کۆمەڵە دەکات ئایینی خۆییان پێ نوێ دەکاتەوە، دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ، يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (المائدة: ٥٤)

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە هەرکامێکتان لە ئایینەکەی هەڵگەڕێتەوە ئەوە لە مەودوا خوا کۆمەڵێك دێنێ کە خۆشی دەوێن‌و خۆشیان دەوێ، لە ئاست بڕواداران نەرم‌و گەردن کەچ‌و لەڕاست بێ بڕوایان زاڵ‌و بەهەیبەتن، لەڕێی خوادا جیهاد دەکەن‌و لەسەر کۆنەی سەرکۆنەکەران ناترسن، ئەوە چاکەو بەخششی خوایە دەیدات بەهەرکەسێك کەبیەوێ وەخوا -بەخشین و دەستەڵاتی- فراوانەو زانایە.

وەك دەبینین یەکێك لەشەش سیفەتە گرنگ‌ وبنچینەیی‌یەکانی ئەو کۆمەڵەی کە خوا لەهەر چاخ وڕۆژگارێك دا ئایینی وەلانراوو شێوێنراوی خۆییان پێ دەبووژێنێتەوەو دێنێتەوە مەیدانی ژیان و گوزەران بریتیە لە نەترسان‌و بێ باکی یان لەتوانج‌و پلارو تانەو تەشەری خەڵکی!

ئەمە ڕاستی‌یەکی نکوولی لێ نەکراوە کەهەرکەسێك لەقسەوقسەلۆك‌و پڕوپاگەندەو توانج‌و تەشەری خەڵکی بترسێ هەر دینداری بۆ ناکرێ چ جای بتوانێ ئایین‌و بەرنامەی خوا نوێ بکاتەوەو بگێڕێتەوە نێو گۆڕەپانی ژیان‌و گوزەرانی کۆمەڵگا!!

www.alibapir.net

بەڵام ئایا گوێ نەدان و بێ باك بوون لە لۆمەو سەرکۆنەو تانەو تەشەری خەڵکی مانای وایە ئینسان هیچ دەربەستی ڕازی بوون و تووڕەبوونی خەڵکی نەبێ بەهەق بێ یان بەناهەق؟!

وەئایا گوێ نەدان بە توانج وپلاری خەڵکی ئەوە دەگەیەنێ کە ئینسان هیچ گرنگی بەدڵ ڕاگرتنی خەڵك و جەماوەرو سەرنج ڕاکێشانیان بۆ ئیسلام بەشێوەیەکی حەکیمانەو سەرئەنجام خەملاندن و پێك هێنانی قاعیدەی جەماوەری نەدات و هیچ حیسابی بۆ نەکات؟!

وە ئایا بێ باکی لەقسەوقاڵی خەڵکی وپشت گوێ خستنی گلەیی و گازندەی بێ جێ یان ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە ئینسان بەناوی جیهادکردن و کافر قڕکردنەوە مەلای مەزبوورانە لەسەر کەلێ خوار نەیەتە خوارو قسەو ئامۆژگاری دڵسوزانەی هیچ کەس بەگوێدا نەچێ ولەجیاتی ئەوە شافیعییانە بڵێ: *(رَأْيِي صَوابٌ يَحْتَمِلُ الخَطَاءَ، وَرَأْيُ غَيْرِي خَطَأٌ يَحْتَمِلُ الصَّوابَ)* !!واتە: (بۆچونی خۆم پێ ڕاستەو دەگونجێ هەڵەش بێ، وە بۆ چوونی بەرامبەرمم پێ هەڵەیەو دەگونجێ ڕاست بێ)!!، بڵێ: *(رَأْيِي صَوابٌ لايَحْتَمِلُ الخَطَاءَ، وَرَأْيُ غيري خَطَاءٌ لايَحْتَمِلُ الصَّوابَ)* ..واتە: (بۆ چوونی من ڕاستەو نالوێ هەڵەبێ و، بۆ چوونی بەرانبەریشم هەڵەیەو ڕێی تێ ناچێ ڕاست بێ) !!

وە ئایا بەم عەقڵیەت و تێڕوانینە ئیشك و داخراوو دۆگمایی یەوە هیچ کارێکی خێر بۆ ئیسلام دەکرێ و کەسانێکی ئاوا دارێکیان بۆ لەسەر بەردێك دادەنرێ کەدواتر ئیسلام ومسوڵمانان لێ بەهرەمەند بن و لەسەری قەرزدار نەبنەوە؟!

دیارە بەلای منەوە وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە (نەخێر)ەو، بۆ هەرکەسێکیش ڕاو بۆ چوونێکی جیای هەبێ دەرگای گفت وگۆمان لەسەر پشتەو، بۆ سەلماندنی ڕاستیی قسەو بۆ چوونەکانیشم بەڵگەی شەرعی وعەقڵی بەهێزو بەبڕشتم لەمشتە.


www.alibapir.net

## ٦- جەنگ و جیهاد بەدیلی بانگەواز نیەو بە پێچەوانەش بەڵكو تەواوكەری یەكترن

ئەم ڕستەیەی سەرێ كە كردوومانەتە (سەرباس)، بۆ هەركەسێك شارەزای قورئان‌و سوننەت‌و سیرەو ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێت شتێكی زۆر ئاشكراو ڕوونە، بەڵام حەیفێ كەسانێك كە لەبواری كارو جم وجوڵی ئیسلامیش دا چالاكی‌یان هەیە لەسۆنگەی نەشارەزایی‌و قووڵ نەبوونەوەو ڕۆنەچوون لە ئیسلام دا، یان بەهۆی دڵگەرمی‌و زاڵبوونی عاتیفەدا، بەدوو ئاڕاستەی پێچەوانەدا لە دەرك كردنی ئەو حەقیقەتەدا دووچاری هەڵەو لێ شێوان بوون:

هەندێكیان پێیان وایە كەئیسلامی‌یەكان هەر لەگەڵ دەستیان گەیشتە چەك‌و هێزو بڕە دەسەڵاتێكیان پەیدا كرد، ئەوە هیچ پێویستیان بە خەڵك بانگ كردنەلای خواو ئایینەكەی -بەهۆی بانگەوازی حەكیمانەو فێركردنی پەببانی‌یانەوە- نەماوە بۆگۆڕین‌وڕاست كردنەوەو چاككردنی كۆمەڵگا، چونكە -بەخەیاڵی كاڵی ئەوان- ئەوە پیشەوكاری خەڵكی دەستەپاچەو بێ دەسەڵاتەو پێچەوانەی عیززەتیشە!!

بێ خەبەر لەوە كە چەك‌و هێزو دەسەڵات لەئیسلام دا بەس وەسیلەیەو قەڵغان‌و سوپەری سەر سەری كارو بانگەوازی ئیسلامی‌و، ، پاشان كیان‌و قەوارەی ئیسلامی یەو خۆی لەخۆیدا ئامانج نیە! وەبێ خەبەر لەوە كە یەكێك لەسێ خەسڵەتە هەرە مەزن‌و وبنچینەیی یەكانی ئوممەتی ئیسلام پاش دامەزراندنی


www.alibapir.net

حکوومەتو [11] قەوارەی سیاسییش بریتیە لە بانگەواز کردنیان بۆ چاکە کەئیسلامە !!

خوای پەروەدگارو دادگەر لەبارەی قەڵغانو سوپەر بوونی چەك وهێز بۆ سەر سەری ئیسلامو مسوڵمانان بانگەوازو وکیانو قەوراەکەیان فەرموویەتی: ﴿ وقاتِلُوهُمْ حَتَّى لاتكُونَ فِتْنَةٌ ويَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلهِ.. ﴾ (الأنفال:٣٩) وەلەبارەی بانگەواز کردنی ئۆممەتی ئیسلام بۆ خێروچاکە فەرموویەتی: ﴿ وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الخَيْرِ ويَأْمُرُونَ بِالمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ المُنْكَرِ وأُولَئِكَ هُمُ المُفْلِحُونَ ﴾ (آل عمران: ١٠٤)

بەڵێ چەكو هێز دەستەڵات لەدەست مسوڵمانانەوە بەس وەسیلەو هۆکاری ڕێ خۆشکەرو کۆسپ لابەرو پارێزەرە بۆ خۆیانو پەیام وبانگەوازەکەیان چ لەحاڵەتی هەبوونی کیانو حکوومەتو چ نەبوونیشیدا.

ئینجا هەندێکی دیکەش لەئیسلامی یەکان بەپێچەوانەی ئەوانەی پێشووەوە پێیان وایە کە کارو جمو جوڵی ئیسلامی بۆ چاککردنو بژارکردنو بەرەو خواو ئیسلام گێرانەوەو هێنانەوەی خەڵك و کۆمەڵگاو چەسپاندنی حوکمو بەرنامەی خوای پەروەردگارو دادگەر لەزەویدا، لە هیچ قۆناغێك دا پێویستی بەچەكو وهێز نیەو، پەکی لەسەر دەستەڵات نەکەوتووە، هەتا بەلەباریو بەبێ خشپەو هەر بەخشکە کیانو حکومەتی ئیسلامی بنیات دەنرێ! جا ئەوکاتە بەبێ کێشەومشت ومڕوهەرا وەزارەتی بەرگری (وزارة الدفاع) دادەمەزرێو لەشکرو سوپای ئیسلامیش پێك دەهێنرێو خوا وەتحەسێنێ ! !

بێئاگا لەوە کە دوژمنو ناحەزانی خواو ڕێبازەکەی هێندە پیاوباشوسەلامەت نین کەهەروا بەسێنایی ڕازی بن جلەووکورسی حوکمو

[11] چونکە ئایەتی ژمارە (١٠٤)ی (آل عمران) مەدەنی یەو پاش دامەزرانی حکومەتی ئیسلامی هاتۆتە خوارێ.

www.alibapir.net

دەستەلاتیان لێ وەربگیرێ‌و بەرەیان لە ژێر پێ دەربهێنرێ‌و، ئەم جۆرە بیرو بۆ چوونانە زیادە ڕۆویی‌یەکی گەورەیان تێدایە لەگومانی چاك بەطاغووتەکان بردن‌و، دڵی خۆ بەخەیاڵ پڵاو خۆش کردن‌و، سەرەنجامیش خۆ بەسەهوو بردن‌و، دەستخەڕۆبوون‌و دەست لەبنی هەمبانەی بەتاڵەوە دەرچوون. بەڵێ ئەم جۆرە بیرو بۆچوونانە خەیاڵ پڵاون‌و نیشانەی سادەیی وبێ ئاگایی‌و سەرکێڵیین هەم لەتێگەیشتن لە دەقەکانی قورئان هەم لەناسینی ماهیەتی کێشەی نێوان بەرەی هەق‌و باطل‌و هەم لەدەرك کردنی جەوهەری طاغووتە خۆ بەخوا زانەکانیش دا ، بۆ سەلماندنی ئەم قسانەشم لەنێو دەیان دەقی قورئان وسوننەتدا بەس ئەم دوو دەقە قورئانی‌یە بە نموونە دێنمەوە.

(ا)- ﴿...ولا يَزالُونَ يُقاتِلونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ إِنِ آسْتَطاعُوا.. ﴾ (البقرة: ٢١٧).

(ب)- ﴿.. وقالَ الّذين كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنكُمْ مِنْ أَرْضِنا أَوْ لَتعَوُدُنَّ في مِلّتِنا..﴾ (إبراهيم: ١٣).

بەڵێ ئەهلی کوفرو طاغووتەکان بەهێزی مەنتیق *(قوة المنطق)* لەگەڵ ئێمەدا نادوێن تاکو پێویستمان بەچەك‌و هێز نەکات لەبەرانبەریان داو بێجگە لەبەڵگەو دەلیل خەمی شتێکی دیکەمان لەبەر نەبێت، بەڵکو ئەوان هەمیشە بە مەنتیقی هێز *(منطق القوة)* لەگەڵمان دەجووڵێنەوە بۆیە ئێمەش چارمان ناچارە کە بەوزمان وشێوازە بیاندوێنین کە غەیری ئەوە نافامن !!

کەواتە: لەم برە توێژینەوەوە بۆمان دەرکەوت کە ڕاستە جەنگ‌و جیهاد بەدیل‌و کەلێن پڕکەرەوەی بانگەوازو فێرکردن‌و ڕاگەیاندن نیەو، هەروەها ئەمانیش بەدیلی جەنگ‌و جیهادو هێزە دەستەلات نین، بەڵکو هەموویان تەواوکەری یەکترن‌و هەر دووك لایان وەك دوو شاباڵی مەلێك وەك یەك پێویستن بۆ کارو جم وجۆڵی ئیسلامی.

www.alibapir.net

## ٧- با له پێشاندان و پاراستنی عیززەت و هەیبەت دا بەهەڵەدا نەچین!

یەکێکی دیکە لەو مەسەلانەی کە ژمارەیەك لەئیسلامی یە موجاهیدەکان لەسەر ئاستی قیادەو قاعیدەو لەکوردستان و شوێنەکانی دیکەی جیهانی ئیسلامیش دا تێیدا دووچاری هەڵەوپەڵە بوون و دەبن، ئەوەیە کە بەحیساب عیززەت و هەیبەتی ئیسلام دەپارێزن و، بەو بیانووەوە هەڵس و کەوت و ڕەفتاری زۆر بێ جێ و سەیرو سەمەرەو زەق و ڕەقیان لێ دەپشکوێتەوە، بەجۆرێك دەجووڵێنەوە کە ببنە جێگای سام و هەیبەت و ترس و لەرز خستنە دڵی خەڵکەوە چونکە واحاڵی بوون کە هەیبەت و عیززەتی ئیسلام و جیهاد بەو جۆرە پارێزراو دەبێ!

بێ خەبەر لەوە کە ئەو جۆرە ڕەفتارو خۆڕانواندنانە ئەگەر شەرعی و ڕەواش بن بەس لەگەڵ ئەهلی کوفرو ئەویش لەکات و گەرمەی جەنگ و کوشتاردا دروست و ڕەوان، وەك لەخاڵی چوارەم دا باسمان کرد.

ئەگەرنا لەحاڵەتی سروشتی و ئاسایی و لەکاتی جم و جۆڵە کۆمەڵایەتی یەکان دا بابای مسوڵمان چ موجاهید بێ چ غەیری موجاهید، پێویستە خۆشویستراوو ڕێزلێگیراو بێ نەك سام لێ کراوو ترس وبیم لێ کراو!

ئێستاش با چەند دیاردەو دیمەنێك کە لەملاولاوە لەو جۆرە کەسانە دەبینرێن و، مایەی تانەوتەشەردان لەئیسلام و مسوڵمانان و جیهادیشن بخەینە بەرچاو:

<u>یەك:</u> ڕەت بوون بە بازگە (سیطرة)کان دا بەبێ ڕاوەستان وسڵاوکردن و ڕێز پێشاندان بۆ ئەوانەی لە بازگەکان دا وەستاون، وە

www.alibapir.net

پابەند نەبوون بە یاساکان (قوانین)ی هاتووچۆوە لەنێوشارەکان دا، وەسەرپێچی کردن (مخالفة)ی جۆراو جۆر وەك ڕۆیشتن لەکاتێك دا ترافیك لایتی سوور هەڵکراوەو، پێچ کردنەوەو بادانەوە لەغەیری شوێنی تەرخان کراوداو، ڕێز نەگرتنی پۆلیسی ڕێگاوبان و.. هتد.

دوو: گەڕان و سووڕان وپیاسە کردن بەتفەنگ و چەك وتاقمەوە بەجادەو کۆڵان و شەقامەکان داو بەدیمەنێکی شەڕەنگێزانەو بەفیزو کەشخەو دەمارەوە.

سێ: توند لێخوڕینی سەییارەو تیژ تێپەڕین و تۆزوخۆڵ کردن و قوڕوچڵپاو پرژاندن بۆ خەڵك.

چوار: ڕەفتار کردن لەگەڵ خەڵکیدا بەتوندی و ڕەقی مۆن و مرچی نێو چاوان گرژی و بەکارهێنانی تەعبیرو وشەی زبرو بێ ئەزاکەت.

پێنج: یەکلا کردنەوەی کێشەو مشت و مڕە فیکری وکۆمەڵایەتی وسیاسییەکان لەگەڵ چین و توێژەکانی کۆمەڵگادا -کەپێویستە بەشێوازی گفت و گۆو شەڕقسەی حەکیمانەچارەسەر بکرێن- بەزەبری چەك و هێزو ترساندن وهەڕەشە، کە بێگومان ئەو جۆرە هەڵس و کەوتانە لەگەڵ ئیسلام و ئادابە بەرزەکانیدا نێوانیان ئاسمان وڕێسمانە.

## ئینجا لەکۆتاییدا دەڵێم:

دەبێ وریابین و لەتێگەیشتنی ئەو یاسایەدا کە لەخاڵی چوارەم دا نووسیمان، دووچاری هەڵە نەبین، چونکە هەرچەندە دەستوورو شێوازی کاتی جەنگ و ڕوو بەڕوو بوونەوە لەگەڵ دوژمنان دا توند تیژی و ڕەقی و زبری و بێ ڕەحمییە. بەڵام تەنانەت لەو حاڵەتەش دا ئیسلام مسوڵمانانی ئازاد نەکردووە چۆن حەز دەکەن و بە بەرژەوەندی خۆیانی دەزانن وا ڕەفتار بکەن. بەڵکوپابەندی کردوون بەکۆمەڵێك دەستوورو یاساو ئادابەوە کە پێوستە ڕەچاویان بکەن و، بەبیانووی


www.alibapir.net

جیهاد کردن و کاتی ناچاری و تێگیراوی‌یەوە فەرامۆشیان نەکەن، خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ وقاتِلوا في سَبيلِ اللهِ الَّذِيْنَ يُقَاتِلونَكُمْ ولاَتَعْتَدوا إنّ اللهَ لايُحِبّ المُعْتَدِيْنَ ﴾ (البقرة:١٩٠)، وەهەروەها فەرموویەتی: ﴿ يا أَيُّها الذين آمَنوا كُونوا قَوّامِينَ لِلهِ شُهَداءَ بِالقِسْطِ ولايَجْرِمَنَّكُمْ شَنآنُ قومٍ علىٰ ألاّ تَعْدِلوا إعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوىٰ واتّقوا اللهَ إنّ اللهَ خَبيرٌ بِما تَعْمَلون ﴾ (المائدة: ٨).

واتە: ئەی ئەوانەی‌بڕواتان هێناوە لە پێناوی خوادا ڕاوەستاوبن و شایەدی بەدادگەری‌ی بدەن، وەبا ڕق هەستانتان لەکۆمەڵێك بەرەو خراپە پەلکێشتان نەکات و، واتان لێ نەکات کە دادگەری نەبن، دادگەری بکەن ئەوە لەپارێزکاری‌یەوە نزیکترە وە پارێز لەخوا بکەن، بێگومان خوا شارەزایە بەوەی دەیکەن.

بەڵێ لەکاتی جەنگ و کوشتاریش دا ستەم و دەستدرێژی ڕەوانیە و ڕێ‌ی پێ نەدراوە لەگەڵ کەسانێك دا کە دوژمنی سەرسەختیشتن نابێ بێ وێژدانی و نادادگەری بکەی !!

هەڵبەتە ئایەت و فەرموودە لەوبارەوە زۆرن و لێرەدا مەودای ئەوەمان نیە بیانخەینە ڕوو، بەڵام دەڵێم:

کەڵە پیاوێکی وەك (صلاح الدین)ی ئەییوبی کە لەچاخ و سەردەمێکی یەکجار سەخت و دژواردا توانی سەرکردایەتی سوپای ئیسلام بکات و، لەشکرکێشی خاچ پەرستەکان پاشەکشە پێ بکات و، قودس ڕزگار بکات، چەندە بەهۆی پاڵەوانێتی و شەڕزانی و ئازایەتی و بوێری ناوبانگی دەر کردووە -بەتایبەت لەلای دوژمن وناحەزانی- هێندەو بگرە پتریش بەهۆی جوامێری و ڕەوشت بەرزی و لێبوردەیی و لێزانی و بەخشندەیی‌یەوە، سوپاو لەشکرەکەی بەتایبەت و مسوڵمانانیش بەگشتی چەندە ترس وسامیان لێ‌ی هەبووە چەندان هێندە خۆشەویستی وڕێزو حورمەتیان بۆی هەبووە، بۆیەش بووە بەو کەڵەقارەمان وجوامێرە کە دوژمن و ناحەزانی پێش دۆستانی دان


www.alibapir.net

بەفەزڵو گەورەیی‌و لێهاتوویی‌دا بنێن و، سەری ئیسلام‌و ئالآی دینی‌خوا بەرەوشتی بەرزی بەرز بکاتەوەو، بە مەعنای ووشەیش هەم لەمەیدانی جەنگ‌و جیهادو ڕوو بەڕووبوونەوەداو هەم لە بواری هەڵس‌و کەوت‌و ڕەفتارو ئاکاریش دا عیززەت‌و حورمەت‌و هەیبەتی ئیسلام‌و مسوڵمانانیش بپارێزێ‌و، ئاووشۆرەتی ئازایەتی وفیداکاری‌و دادگەری چاکەکاری مسوڵمانانی موجاهید بگەیەنێتە کەهکەشانی فەلەك!

کەواتە: بائێمەش بەو جۆرە ڕاست وشەرعی‌یەی ئەو پێشینە ڕەسەنانەمان ئابڕوو وحورمەت‌و عیززەتی ئیسلام مسوڵمانان بپارێزین، نەك خوانە کردە نەفس‌و شەیطان فریومان بدەن‌و فێڵمان لێ بکەن و گیرۆدەی هەڵس‌و کەوت‌و کردەوەوهەڵوێستی ناشەرعی‌یانەی خوارو خێچمان بکەن‌و، لەحاڵێك دا کەبەخەیاڵی خۆمان عیززەت‌و کەرامەتی ئیسلام دەپارێزین! ببینە مایەی ناو زڕانی خۆمان‌و جیهادەکەمان‌و لەبەرچاو بێزرانی ئایین‌و بەرنامەی بێ هەڵەو پەڵەی خوای دادگەرو بێ هاوتاش (١٢)

---

(١٢) پێشینان گوتوویانە: (هەر عەقڵە لەخەسارێك) چەند جارێك ڕوویداوە کە بەهۆی ڕەفتارو هەڵوێستی نەزانانەو کرچ‌و کاڵو حیساب بۆنەکراوانەی برایەکی موجاهید یان چەند برایەك لەگەڵ بازگەیەك یان کۆمەڵێك لەلایەنە عەلمانی‌یەکان دا، کێشەوفەرتەنەیەك بۆ بزووتنەوەی ئیسلامی دروست بووە کەزۆری لەسەر کەتووەو بەگران بۆی تەواو بووە! جاسەیر ئەوەیە کە ئەو برایە یان ئەو چەند برایە کە ئەو هەڵوێست وڕەفتارەشیان لێ پشکوتۆتەوە. پێیان وابووە ئەگەر ئاوا نەکەن‌و لەسەر ئەو شتە جوزئی‌یە کێشەو هەرایەك نەنێنەوە، مانای وایە عیززەتی ئیسلامیان نەپارستوەو، ئیسلام وجیهاد لەلایەن ئەوانەوە کەلێنی تێ کەوتووە! بێ خەبەر لەوە کەئیسلام ومسوڵمانان بەهۆی ئەو عیززەتە جوزئی‌یە وەهمی‌یە کە ئەوان تۆماریان کردووە باجێکی هێندە قورس و گەورەی مەعنەوی وماددی داوە مەگەر هەر خوا بزانێ چۆن بووەو، عیززەتە گچکە وەهمی‌یە تۆمار کراوەکەی ئەوانیش پلیشاوەتەوەو بۆتە جوزئێك لەباج‌و زیللەتیکی زل وبێ بەرهەم (*)!

(*) بێ بەرهەم بۆ کارو جمو جوڵی ئیسلامی، ئەگەرنا شەهیدانی ئیسلام خاوەنی بەرزترین پلەو پاداشتن.



www.alibapir.net

بێگومان هیچ کاتێکیش هیچ جۆرە بەرژەوەندی یەکی ئیسلام - پاراستنی عیززەت و غەیری ئەوەش- بەسەرپێچی لەیاساکانی شەرع و ڕەفتار کردن بەگوێرەی طەبع و میزاج وعاتیفەو، پەنابردنەبەر وەسیلە ناشەرعی یەکان، دابین ناکرێ بەڵکو ئەو جۆرە بیرکردنەوەو مومارەسە هەڵانە زیان و زەرەری ڕووتن و مایەی عەیبداری لای خەڵک و گوناهباری لای خوان، وەئامانجە بەرزو پاکە شەرعی یەکانی ئیسلام بەس لەڕێی هۆو وەسیلە پاك وچاکە شەرعی یەکانەوە دێنەدی.

## دوا قسەم ...

شتێکی ئاشکراو ڕوونە کە ئێمە کاتێك ڕووی ڕەخنەو گلەیی و سەرکۆنە لەهەندێك خەڵکی خۆمان دەکەین لەسەر هەندێك بیرکردنەوەو هەڵس و کەوتی هەڵەوپەڵە کە لەڕووحی ئیسلامەتی و یاساو ئادابەکانی یەوە دوورن و لەگەڵی ناکۆکن. مانای ئەوە نیە کە ڕەخنەو گلەیی و گازندەمان لە غەیری ئەوانیش نەبێ -بەتایبەت حیزبە عەلمانی یەکان- کە هەرچۆن حیساب بکرێ هەڵەوپەڵەو کەم وکووڕی یەکانی ئیسلامی یەکان سەد یەکی غەڵەت وپەڵەت و خراپەکانی ئەوان نابێ، بگرە هەر ناگونجێ پێکەوە بخرێنە تەرازووێکەوە، چونکە ئەگەر بابایەکی ئیسلامی بەهۆی لادان (إنحراف)و بەهەڵە حاڵی‌بوون و بەهەڵەڕەفتارکردنەوە دووچاری هەندێك گوناح و کەم و کووڕی ببێ ئەوان لەسۆنگەی ئەوەوە کەهەر نەسڵەن لەسەر ڕێبازی خوا ناڕۆن و بەگوێرەی شەرع بەڕێوە ناچن و ملی کوێرەڕێیانیان گرتوە، هەمووگیانیان لادان و تاوان و خراپەیە، بەڵام هەروەك چۆن ڕاست وڕەوا نیە ئیسلام لەگەڵ ڕێچکەو بیردۆزەکانی ئەوان دا بخرێتە تەرازوەوەو پێکەوە قیاس و بەراورد بکرێن، دروست و گونجاویش نیە کە پەیڕەوان و شوێن کەوتووانی ئیسلام و ئەو ڕێچکەو بیردۆزانەش پێك هەڵبسەنگێنرێن و بەراورد بکرێن! چونکە هەروەك



www.alibapir.net

چۆن جیاوازی نێوان هەق وباطڵ هێندەی جیاوازی نێوان بوون ونەبوون (الوجود والعدم)و ڕووناکی وتاریکیو ئاسمانو زەمینە، پێویستە جیاوازی نێوان بەژی هەقو بەرەی باطڵیش لە چاکیوپاکی وڕاستو دروستو دادگەریومیهرەبانیو کارامەییو لێزانیدا هەروا بێتو، هەروەك چۆن ئەهلی باطڵ لەقەدەر باطڵی خۆیانن دەبێ ئەهلی هەقیش لەقەدەر هەقی خۆیان بن.

کەواتە پوختەی قسان ئەوەیە کە ئێمە بۆیە ڕەخنەو گلەییوسەرکۆنە ئاڕاستەی هەندێك لەخەڵکی خۆمان دەکەین چونکە لەئاستی بڵندی ئیسلام دا نینو، لەچاو ئیسلام دا نزموگچکەو خوارن، نەك لەقەدەر خەڵکیتر کەلە سۆنگەی لادانیان لە ئایینی خواو گیرۆدە بوونیان بەتەڵەوداوی شەیطان وطاغوتەکانو ڕێچکەو کوێرەڕێیەکانیانەوە نزمیو خوارو خێچیوستەمو خراپەوناڵەباری وەك تۆقی عەزازیل کەوتۆتە گەردنیانو هیچ چاوەڕێی قوتار بوونیان نیە، مەگەر بە پەشێمانیو ڕاست بوونەوەو گەڕانەوەبۆلای خواو بەرنامەکەی.

کەواتە: با ئیسلامییەکان خۆیان لەگەڵ غەیری خۆیان دا قیاسو بەراورد نەکەن، بۆ ئەوەی لەئەنجامی ئەوەدا بەهەڵەدا نەچنو دڵیان بەخۆیان خۆش بێو بڵێن: الحمدلله ئێمە زۆر باشینو خەڵك -واتە خەڵکی نائیسلامی- لەئێمەخراپترەو هەڵەو خراپەکانی ئێمە هەرچۆن بێ تۆزی ڕێی خراپەوتاوانەکانی ئەوان ناشکێنن !چونکە وەك پێشتر گوتمان ئەو قیاسو بەراوردە لەبناغەوە هەڵەیەو بە بەڵگەناشێ.

وەبا نامسوڵمان وبێ دینەکانیش دڵی خۆیان بەوە خۆش نەکەن کە دەبیستن هەڵەو کەموکووڕی پاڵ دەدرێتەلای ئیسلامییەکان، چونکە ئەو هەڵەوکەمو کووڕییانەی ئەوان لەچاو بەرنامەو ڕێبازە پاك وبێ لەکەکەیانە نەك لەچاو ئەواندا کە مەگەر پەندی: (( پووشکە لەکایە ناگیرێن )) بتوانێ تەعبیر لەئەندازەو ڕێژەی هەڵەوخراپەوتاوانەکانیان بداتەوە..



www.alibapir.net

